# بزووتنەوەی ئیسلامی و

## ئاسۆیەکی گەش و ڕوون

### بنەما شەرعی‌یەکان و بنچینە ئەخلاقی‌یەکان




نووسینی

**عەلی باپیر**

چاپی یەکەم

١٤١٧ ك - ١٩٩٧ ز

هەولێر

# بزووتنەوەی ئیسلامی و

## ئاسۆیەکی گەش و ڕوون

### بنەما شەرعی‌یەکان و بنچینە ئەخلاقی‌یەکان

---

نووسینی

**عەلی باپیر**

چاپی یەکەم

١٤١٧ ک - ١٩٩٧ ز

هەولێر

# پێشکەش بۆ

بەو بڕواداره فیداکارانەی کە لەپێناوی ڕازی کردنی خوادا بەهۆی بووژاندنەوەی ئایینەکەی‌و بەرپاکردنەوەی بەرنامەکەیەوە لەژیان و گوزەرانی کۆمەڵگادا، لەهەرچی جۆری ترس و تەماع و فشارو گرفتاری‌یەك بێ باکن و هەتا بڵێی چوست و چالاکن.



# ڕوونکردنەوەیەک

بۆیە ئەم نامیلکەیەم ناونا (بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەکی گەش و ڕوون) چونکە قەناعەتم وایە ئەگەر بزووتنەوەی ئیسلامی بەقیادەو قاعیدەیەوە بتوانێ چاو بەخۆیدا بگێڕێتەوەو بەپێی ئەم بنەما شەرعیو بنچینە ئەخلاقییانە بەرەوپێش بچێ، ئەوە بەرەو داهاتوویەکی باش و ئاسۆیەکی گەش و ڕوون دەچێ، جا لەسەر بناغەی ئومێدی خێرو متمانەداربوون بە دڵسۆزانی نێو بزووتنەوە کە ئەو کارە ئەنجام بدەن وەک گەشبینییەک ئەو ناوەمان لەم نووسراوە نا.

---

* * *

# پێشەکی

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونصلي ونسلم على رسول الله محمد افضل صلاة وأتم تسليم وعلى آله وصحبه أجمعين والتابعين لهم باحسان الى يوم الدين.

بەڕێزان پێشمەرگەو ئەندام و لایەنگرانی بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستان دا

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته.

شتێکی ئاشکراو نکوڵی لێ نەکراوە لای هەموومان کە بزووتنەوەی ئیسلامی کاریگەری‌یەکی گەورەی لەسەر گۆڕەپانی کوردستان داناوە لە بواری بووژاندنەوەی ئیسلام و گێڕانەوەی خەڵکێکی زۆر بۆ باوەشی ئیسلام و پەرەپێدان و بەرەو پێش بردنی کاری ئیسلامی‌و... هتد، بەڵام دیسان هەمووشمان دەزانین کە بزووتنەوەی ئیسلامی گیرۆدەی چەند دەردو نەخۆشی‌یەك بووە کە هەتا ڕاددەیەکی زۆر پەکیان خستووەو سست و لاوازیان کردووەو، وایان کردووە کە بزووتنەوە لەگەڵ هەڵ و دەرفەت ڕەخسانی گونجاوو لەباریش دا نەتوانێ نەقشێکی ئەوتۆی هەبێ لەسەر ڕەوتی ڕووداوو گۆڕانکاری‌یەکان و زیاتر حاڵەتێکی (لەپەراوێزدا بوون) بەخۆوە بگرێ لەجیاتی پێشەنگ بوون و سەرقافڵەیەتی!!

ئنجا شتێکی ڕوونیشە کە هەر موسوڵمانێك بەرانبەر بە موسوڵمانان و کاروباریان بەرپرسیارەو پێویستە مشووریان لێ بخوات و بەتەنگیانەوەبێ، دەقی قورئان و سوننەتیش لەو بارەوە یەکجار زۆرن، بۆ وێنە ﴿ولتكن منكم أمة يدعون الى الخير ويأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر وأولئك هم المفلحون﴾ آل عمران (١٠٤) هەروەها فەرموویەتی ﴿والمؤمنون والمؤمنات بعضهم أولياء بعض يأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر ويقيمون الصلاة ويؤتون الزكاة ويطيعون الله ورسوله أولئك سيرحمهم الله إن الله

عزيز حكيم﴾ التوبة (٧١). پێغەمبەری خوداش ﷺ فەرموویەتی (الدين النصيحة) قيل لمن؟ قال (لله ولكتابه ولرسوله ولأئمة المسلمين وعامتهم) رواه مسلم، هەروەها فەرموویەتی (من لم يهتم بأمر المسلمين فليس منهم) رواه الطبراني.

جا بەڕێزان!

بەندە بۆ نووسینی ئەم نامیلکەیەی بەر دەستتان وێڕای ئەو هاندەرە گشتی‌یەی کە باسم کرد، چەند هاندەرێکی دیکەی گرنگیشی هەبوون کە بەپێویستی دەزانم ئەگەر بەکورتیش بێ - بەر لەوەی بچمە سەر ئەسڵی مەبەست - ئاماژەیەکیان بۆ بکەم:

١- ئێستە هەبوونی (بزووتنەوەی ئیسلامی) هەتا شتێکی لەم باشتر پەیدا دەبێ‌و دەبێتە جێدار (بديل)ی، بەپێویستی‌یەکی شەرعی‌ی دەزانین بۆ پاراستن و گەشە پێدانی کارو چالاکی ئیسلامی لە کوردستاندا، چونکە هەرچەندە کاتی خۆی بالی چەکداری‌ی بزووتنەوەی ئیسلامی زیاتر بەهاندەری بەرگری کردن لەگەل کوردو دژایەتی کردن و بەرەنگاربوونەوەی ڕژێمی درندەو بێ‌ویژدانی بەعس درووست بووە، بەلام؛ یەکەم: کارو چالاکی بزووتنەوە بەس لەم بوارەدا کورت هەڵنەهاتووە، بەلکو مەیدانی چالاکی چەکداری‌و بەرگری کردن لەچەوساوەیی کورد یەکێك بووە لە مەیدانەکانی کارو خەباتی، دووەم: ئێستاش مەترسی ڕژێم کەم و زۆر لەسەر کوردستان هەر ماوە، سێیەم: لەم بارو دۆخەی ئەمڕۆی کوردستان دا بەبێ هەبوونی بزووتنەوە بووژانەوەو کارو چالاکی ئیسلامی لەکوردستان چەترو سێبەرو قەلایەك لەدەست دەدات کە مایەی سام و هەیبەت و شەرم لێکرانی‌و دڵ پێ‌خۆشکرانیەتی‌و، بەهیچ شتێکی تریش ئەو کەلێنەی بۆ پڕ ناکرێتەوەو ئەو زیانەی بۆ قەرەبوو ناکرێتەوە.

بەڵێ! بزووتنەوەی ئیسلامی وێڕای چەند ئیمتیازو تایبەتمەندیەکی گرنگ لەبەرنامەی فیکری‌و پەروەردەیی‌و سیاسی‌دا ، ئەو چەك و هێزەی پێشیەتی لەهەموو

حاڵ و ئیحتیماڵێکدا لەواقیعی ئەمڕۆی کوردستان و عێراقیش دا قەڵغان و سوپەرێکی پێویستەو لەجێگای شمشێرەکانی بەنی هاشم (سیوف بنی هاشم)ی سەردەمی پێغەمبەری خوا و هاوەڵە بەڕێزەکانیەتی (رضي الله عنهم) کە بۆ پێغەمبەرو هاوەڵانیو پەیامەکەی شتێکی پێویست و سرووشتی بوون.

هەر بۆیەش بەندە وێرای مشوور خواردن لەحاڵەتی ئیسلامی بەگشتیو هەڵسەنگاندنیو ڕێڕوونی کردنی[1]، زۆرترو زیاتریش خەمی لە بزووتنەوە خواردووەو بەگوێرەی دەرفەت و بۆلوان و تواناو عەقڵ پێ شکان ڕەخنەو پێشنیارو ئامۆژگاریی خۆی ئاراستە کردووەو هەرکام لە (دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامی)و (بزووتنەوەی ئیسلامیو قۆناغی نوێ)و (بزووتنەوەی ئیسلامی لە دووڕیانی مان و نەمان دا) چەند هەوڵ و هەنگاوێك بوون لەو پێناوەداو (بزووتنەوەی ئیسلامیو ئاسۆیەکی گەش و ڕوون)یش هەوڵ و هەنگاوێکی دیکەیە.

٢- زۆرجاران ئەم پرسیارە ئاراستەی بەندەو هاوەڵانی دەکرێ کە بزووتنەوە بەلار دەزانین و جەخت دەکەین لەسەر ڕاست کردنەوەو چاککردنی بەپێی پێوەرو تەرازووی قورئان و سوننەت؛ کە: ئایا ئێوە دەتانەوێ بزووتنەوە چۆن بێو چی لێ بێ؟!!

جا هەرچەندە پێم وایە کەسانێك موتابەعەی نووسینەکانی ئێمەیان کردبێو سەرنجی کارو هەڵوێستەکانمانیان دابێ، دەزانن چیمان دەوێو دەمانەوێ بزووتنەوە چی لێ بکەین، بەتایبەتی (پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامی). بەڵام بۆ

---

[1] تائێستا لەو بوارەدا (پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامی) و (چەند ڕێنموونییەك بۆ حاڵەتی ئیسلامی لە کوردستاندا) خراونەڕوو، کە دووەمیان لە (١٣) خاڵان پێکهاتووەو (٦)یان چاپ کراون و (٧)یشیان ماون و خوا یاریی بەم زووانە ئامادەی چاپ دەبن.

زیاترو چاکتر بیانوویرین و ((إتمام الحجة))و بەرچاو روون کردنەوە، ئەوە ئەم هەولەش دەخەینە سەر هەولەکانی پێشوو، بۆ ئەوەی هەم کەسانێك کە پشتگیری هەوڵ (محاولة)ەکەمان دەکەن و، هەم ئەوانەش کە بەداخەوە دژایەتی دەکەن و ئاگایانە یان نائاگایانە زەرەر لەخۆیان و بزووتنەوەش دەدەن، بزانن چی دەکەن و باراشی خۆیان لەچ ئاشێك لێدەکەن!

لەبەر ئەو هۆیانە بەپێویستم زانی لەم قۆناغەدا جارێکی تریش توخنە بخەمە سەر پێت و بڵێم ﴿هذه سبيلي ادعوا إلى الله على بصيرة أنا ومن اتبعني وسبحان الله وما أنا من المشركين﴾ يوسف (١٠٨) بۆ ئەوەی هەر کەسێك لەخۆی رادەبینێ بەو بنەما شەرعییانەوە پابەند بێت و بەهێی ئەو بنچینە ئەخلاقییانە رەفتار بکات کەتێمە بۆ بزووتنەوەی ئیسلامی لەکوردستان و هەر کۆمەڵ و بزووتنەوەیەکی دیکەی ئیسلامی لەهەر کوێیەك بێ بەپێویستیان دەزانین، ئەوە بەسەرچاو و شانازی پێکردنەوە لە خزمەتینی، ئەرگەنا با لەو شوێنەو بەو شێوەیە کەخۆی قەناعەتی پێیەتی کار بکات و، کاری ئێمە تێك نەدات و... هتد!

دیارە هەر کەسێکیش هەر تێبینیو رەخنەیەکی هەبێ دەربارەی ئەو مەسەلانەی دەیانخەینە روو بەسەرچاو و سینەی فراوانەوە (إن شاء الله) لێی وەردەگرین، بەلاّم ئەویش پێویستە بەشێوازی شەرعییانەو لەقاڵبی ئەدەبی ئیسلامیدا شتەکانی خۆی بخاتەروو، نەك خوانەکردە شەیتان فریوی بدات و لەژێر پەردەی چاککردن (إصلاح)دا خراپەکاری (إفساد)ی پێ بکات و کوتك و دەھۆڵی پروپاگەندەو زەم و غەیبەتی پێ دەست بداتێ و بێجگە لەخۆیو چەند کەسێك کەرەنگە لەئێعرابی بزووتنەوەدا (محل)یکیان نەبێ، دانی خێر بەکەس دانەھێنێو زەرب بەسەر هەموویدا بێنێ!!



# ڕێ خۆشکردن

بەڕێزو خۆشەویستانم! ئەم نامیلکەیە لە سێ بەشان پێك دێت بەم چەشنەی خوارەوە:

**بەشی یەکەم** : بنەما شەرعی‌یەکانی هەر کۆمەڵ و بزووتنەوەیەکی ئیسلامی.

**بەشی دووەم** : بنچینەکانی هەڵس و کەوتمان لەگەڵ کۆمەڵگادا.

**بەشی سێیەم** : یازدە تێبینی‌و مەسەلەی گرنگ.

جائێمە لەبەشی یەکەم لە حەوت (٧) خاڵاندا ئەو بنەما (أصل) شەرعی‌یانەی کە بۆ هەر کۆمەڵ و بزووتنەوەیەکی ئیسلامی پێویستن دەخەینەڕوو و تاڕادەیەك دەیانتوێژینەوە. تاکو زۆر چاك لەبەر چاومان ڕۆشن بێت کەی دەتوانین بڵێین: ئێمە خاوەنی کۆمەڵ و بزووتنەوەیەکی ئیسلامی شەرعی -واتە ڕاست و ساغ-ین، چونکە وەك زاناو پێشەوایانمان فەرموویانە کاکڵ و جەوهەری (دین) دوو شە: یەکەم بەس خودا بپەرستین و بەندایەتی بۆ بکەین؛ دووەمیش بەس بەو شێوەو چۆنیەتی‌یە ئەو پەرستن و بەندایەتی‌یە ئەنجام بدەین کەخۆی دیاری کردووە، کەدوو وشەی (الإخلاص والإتباع) دەلالەتیان لەسەر دەکەن، چونکە (اخلاص) بەس خواپەرستنەو (اتباع)یش شوێن پێغەمبەرﷺ کەوتنە، هەربۆیەش (فضیل بن عیاض) ئایەتی ﴿لیبلوكم أیكم أحسن عملا﴾ الملك (٢)ی بە (أي أخلصه وأصوبه) لێك داوەتەوەو فەرموویەتی مەبەستم لەساغ بوون (اخلاص)و ڕاست بوون (صواب) ئەوەیە کە بەس بۆ خواو بەگوێرەی شەرعەکەیشی بێ، ئاشکراشە کە بەگوێرەی شەرعی خوا بوونیش تەنها لەڕێگای شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خواوە مسۆگەر دەبێ.

پاشان لەبەشی دووەم دا لەدوو بەندی سەرەکی‌دا باسلو بنچینەکانی هەڵس و کەوتمان لەگەڵ کۆمەڵگاو دەوروبەرماندا دەخەینەڕوو و تیشکیان دەخەینە سەر، بۆیەش جۆرو چۆنیەتی ڕەفتارو هەڵس و کەوتمان لەگەڵ کۆمەڵگادا خستۆتە بەشی دووەمەوە چونکە ئەگەر ئامانجی سەرەکی هەر کۆمەڵێکی ئیسلامی گۆڕین و چاککردنی کۆمەڵگاو دەوروبەرەکەیەتی، ئەوا بێگومان تەنها

کاتێك ئەو کارەی بۆ مەیسەر دەبێ کە بۆخۆی وەك پێویست هەبێو شایستەیی ئەنجامدانی ئەو ئەرکە گرنگ و مەزنەی لەنێویدا هێنابێتەدی، هەربۆیەش خوای زاناو کاربەجێ فەرموویەتی ﴿یاایها الذین آمنوا علیکم أنفسکم لایضرکم من ضل إذا اهتدیتم﴾ المائدە (١٠٥).

بەڵێ بەراستی ئەگەر نەتوانین لەنێوخۆماندا شەرع و بەرنامەی خوا پیادە بکەین و بەو شێوەیە بین کەخوای پەروەردگار فەرمانی پێ کردووین و پێغەمبەری سەردارﷺ فێری کردووین، مەحالە بتوانین ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر کۆمەڵگاو دەوروبەرمان جێبەجێ بکەین، بگرە گەلێك جار خەڵکی لەرەفتارو ئاکاری چەوت و ناشەرعییانەی ئێمە دەسڵەمێنەوەو لەسۆنگەی ئەمەشەوە لە ئیسلامیش کە ئێمە بەهەڵەو لاری نوێنەرایەتیی دەکەین دوور دەکەونەوە، دیارە ئەو تۆبالەش هەر لەئەستۆی ئێمەیە چونکە ئێمە بە بەرزکردنەوەی درووشمی ئیسلامیتیو (ئیسلامی بوون) بڵێین و نەڵێین لەبەر چاوی خەڵکی خۆمانمان کردۆتە ئاوێنەی ئیسلام و چیمان لێ بینن ڕاستەوخۆ لەسەر ئیسلامی حیساب دەکەن!

وەپاشان لەبەشی سێیەم دا یازدە (١١) تێبینیو مەسەلەی زۆر گرنگمان خستۆتەڕوو، کەتێشك و ڕۆشنایی زیاترو چاکتر دەخەنە سەر چۆنیەتی نواندنی هەڵوێست و هەڵس و کەوت کردنمان لەگەڵ کۆمەڵگاو دەوروبەردا، وە لەڕاستیدا زۆر شت کە لەبەشی یەکەم و دووەم دا بەشێوەیەکی کورت باسکراون شەرح و تەفسیرو ڕوونکردنەوەیان خراوەتە بەشی سێیەمەوە، بۆیە حەز دەکەم هەرکام لە تێبینیو مەسەلە گرنگەکانی بەشی سێیەم زۆر بەوردیو سەرنج دانەوە موتالا بکرێو هەڵوێستەی باشیان لەئاقاردا بکرێ.

• • •

# بەشی یەکەم

# بنەما شەرعی یەکان

دیارە ئێمە سوپاس بۆ خواو لێی بەزیادبێ لەکتێبی (پرۆژەی بەرنامەی فیکری‌ی کـاری ئیـسلامی)دا کەتەرخان کراوە بۆ لێکۆلینەوەو روون کردنەوەی ئەو باس و بابەتـە گرنگانـەی کە زانینیان بۆ راست و ساغ ئەنجامدانی کاری ئیـسلامی پێویـستە، لەبەشی شەشەمدا بەناوی (بنچینەکانی کاری ئیـسلامی) بیـست و سێ (٢٣) بنەمامان نووسیبووە[1]، بۆیە هەر کەسـێك بیەوێ بەتێروتەسەلی لەو بارەوە ئاگاداربێ حەوالەی ئەوێی دەکەین و لێرەش ئـەم حـەوت (٧) بنەما گرنگە دەنووسین کە نەبوونی هـەر کامێکیـان کـاری ئـەو کۆمەڵـە ئیـسلامی‌یەی دەیەوێ ئەرکی خۆی ئەنجام بدات پەکی دەکەوێ:

## ١- سەرکردایەتی (قیادە)یەکی شارەزا (فقیە)و سەرڕاست (رشید)و پارێزکار (متقی)

﴿یاءیها الذین آمنوا اطیعوا الله واطیعوا الرسول وأولي الامر منکم﴾

بـەڵێ یەکـەمین و گـەورەترین بنـەماو مـەرجی درووسـت بوونـی هـەر کۆمـەڵ و بزووتنەوەیـەکی ئیـسلامی بریتی‌یـە لەهـەبوونی سـەرکردەو سـەرکردایەتی‌یەکی شایـستە، کەبەبێ هەر کام لەم سێ خەسڵەتەش شایستە نابێ:

---

[1] بروانە لاپەرە (١٤٥) تا (١٦٢).

## یەك :

شارەزا (فقیه) لەئیسلام دا بەواتای قورئانیو سوننەتی ئەم وشەیە نەك بەواتا عورفی‌یەکەی کە بریتی‌یە لەشارەزایی لەشەرع (فقه)داا وەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی (من یرد الله به خیرا یفقهه في الدین...) رواه البخاري، دیارە (دین)یش ئەوەیە کە لەقورئانی خواو سوننەتی پێغەمبەری پێشەواداﷺ هاتووەو غەیری ئەمان هەمووی بەشەرح و تەفسیرو لێکدانەوە دادەنرێ.

## دوو :

سەرراست (رشید) کەفەرموودەی پێغەمبەرﷺ (من یرد الله به خیرا یفقهه في الدین ویلهمه رشده) دەیگەیەنێ، چونکە ئەگەر بەس بە (الفقه في الدین) کاری موسڵمان مەیسەر بوویایە پێغەمبەری خوا ڕستەی (ویلهمه رشده)ی نەدەخستە پاڵی! بەڵێ موسڵمان بەتایبەتی ئەوەی لەپایەی براگەورایەتیو فەرماندەیێتی دابێ پێویستە وێرای شارەزایی قووڵ و فراوان لەقورئان و سوننەتدا، سەرراست و لێزان و وردو وریاو کارەجێش بێ، دیارە ئەمیش بەبێ شارەزایی لەبارودۆخ و واقیعی کارو خەبات مەیسەر نابێ! وەلەراستی‌دا زۆر کەس هەیە ئاڕادەیەك بەدەقەکانی قورئان و سوننەت ئاشنایە، بەڵام کە دێتە سەر چۆنیەتی هێنانەخوار (تنزیل)ی ئەو دەقانە بۆ سەر دنیای واقیع و هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ ڕووداوەکاندا بەچەسپاندنی یاسا شەرعی‌یەکان بەسەریاندا! دەبینی یەکجار کڵۆڵ و دەستەپاچەیەو کورد گوتەنی (وەستای قسان و کۆڵەواری دەستانە)!.

پێویستە ئەوەش بگوترێ کە پەیدابوونی خەسڵەتی سەرراستیو کارامەییو لێزانی تەنها بەشارەزاییو وریایی دەربارەی واقیع و دەوروبەر مەیسەر نابێ، بەڵکو پێویستی بەتێپەڕبوونیش هەیە بە ئەزموونگەلی جۆراو جۆردا، چونکە هەروەك چۆن زانیاری‌ی تیۆری (نظري) بەچوونە نێو جیهانی دەقان (نصوص)و خوێندنەوەی کتێبانەوە پەیدا

دەبێ؛ زانیاریەی کردەیی (عملی)یش بەچوونە نێو دەریای جەم و جۆڵ و چالاکی‌و ڕەفتارو هەڵوێستان دەستگیر دەبێ، ئەگەرنا نابێ؛ پێشینانیش بەخۆڕایی نەیانگوتوە (لەزۆر گەڕاوان بپرسە لەزۆر زیاوان مەپرسە!).

## سێ:

پارێزکار (متقي)، بەڵێ! وێڕای شارەزایی‌و سەرڕاستی بەڕاستی پارێزکاریش خەسڵەتێکی گەورەو گرنگە بۆ هەر سەرکردەو سەرکردایەتی‌یەکی ئیسلامی کەدەیەوێ لەئاستی ئیسلام دابێ، چونکە شارەزایی‌و سەرڕاستی بەبێ پارێزکاری بەس بلەبایەکی (زۆرزان و جەربەزە)یان لێ پەیدا دەبێ‌و هیچی‌ترا هەر بۆیەش لەقورئانی‌دا هەرچی خێرو چاکەی دنیاو قیامەتە بەپارێزکاری (تقوی)یەوە بەستراوەتەوە، وەك لەبەشی هەشتەم (توێشووی ڕێگا)ی (بەرنامەی فیکری...)دا[1] باسمان کردووە.

پێویستە ئەوەش بڵێین کە: بەڕاستی ئەم مەسەلەی سەرکردایەتی‌و مشوورگێرایەتی‌یە بەمەردی بناغەو گەورەترین و سەرەکی‌ترین مەرجی هەر جەم و جۆڵ و کۆمەڵێکی ئیسلامی‌یەو ئەگەر کار لێرەوە تەواو بوو لەهەموو بنەماو بنچینەکانی دیکەش دا تەواو دەبێ‌و، ئەگەر خوانەخواستە لێرەشەوە بەخواری ناتەواوی هات بەهیچ شتێك و هیچ ئەسڵ و بنەمایەکی‌تر ڕاست نابێتەوەو ڕاست نابێتەوە، ئاخر چۆن داری خوار سێبەری ڕاستی دەبێ؛ یان چۆن بناغەی خوار دیواری ڕاستی لەسەر هەڵدەچنرێ؟ یان چۆن درەختی زڕ میوەی بەتام و خۆش دەگرێ؟!!

• • •

---

[1] بڕوانە لاپەڕە (١٨٢) تا (١٩١).

## ٢- دەبێ ڕاوێژ (شوری) بناغەی بڕیارو کاروبار بێ

**﴿وأمرهم شورى بينهم﴾**

بەڵێ پاش هەبوونی سەرکردەو سەرکردایەتی زاناو داناو پارێزکار، بڕیاردان و کاروبار هەڵسووڕاندن لەسەر بناغەی ڕاوێژو پرس و ڕاو تەتەڵەکردن و لەبێژینگ دانی بیروبۆچوونەکان گرنگترین و گەورەترین بنەمای شەرعی کۆمەڵ و بزووتنەوەیەکی ئیسلامی‌یە، هەر بۆیەش خوای زاناو پەنهان بین لەسووڕەتی (الشوری)دا کە مەککەیی‌یە خەسڵەتی کاروبار هەڵسووڕاندن بەپێی ڕاوێژی خستۆتە نێوان نوێژ بەرپاکردن و ماڵ بەخشینەوە، کەدوو خەسڵەتی هەرە گەورەو بنچینەیی تاك و کۆمەڵی موسڵمانن و تەنانەت زۆر لەزاناو پێشەوایان ڕایان وایە کە ئەگەر ئینسانی موسڵمان بەجواندنی هەر فەرزێك کافر نەبێ، بەجواندنی نوێژو زەکات لەثابین دەردەچێ[1]، خوای مەزن فەرموویەتی ﴿...والذين استجابوا لربهم وأقاموا الصلاة وأمرهم شورى بينهم ومما رزقناهم ينفقون﴾ الشورى (٣٨).

وەلەڕاستی‌دا بەدیلی ڕاوێژ جگە لە خۆسەپاندن و تاکڕەوی‌و دیکتاتۆریەت هیچی‌تر نیەو نابێ، پێویستە ئەوەش بگوترێ کە یەکەمین و کاریگەرترین کەس بۆ کارپێ‌کردن یان لەکارخستنی ئەسڵی ڕاویژ شەخسی یەکەم و سەرکردەی ئەو کۆمەڵەیە.

---

[1] (١) بڕوانە (مجموع فتاوى شيخ الإسلام) بەرگی (٧) الإيمان.

## ٣- بەرنامەیەکی شەرعی ڕێك و ڕوون و گونجاو (متناسب) لەگەڵ قۆناغەکانی کارو خەبات دا

﴿لكل جعلنا منكم شرعة ومنهاجاً﴾

ئەمیش سێیەمین بناغەی شەرعی‌یە بۆ هەر کۆمەڵ و جەم و جوڵێکی ئیسلامی، جاهەرچەندە ئەگەر بەسادەیی سەرنج بدەین ڕەنگە بڵێین: دەبوو ئەم بنەمایە لەڕیز (ترتیب)دا یەکەمین بووایە، بەڵام لەڕاستی‌دا وانی‌یە، چونکە:

یەك : هیچ بەرنامەیەکی خوا نەهاتۆتە خوار مەگەر بۆ پێغەمبەرێك، واتە هەتا پێغەمبەرێك دیاری نەکرابێ خوا بەرنامەیەکی نەناردووە، چونکە بەرنامە ئەگەر شەخسێکی شایستە وەری نەگرێتو پیادەی نەکات دەبێتە شتێکی پووچ (عبث)و بێ حیکمەت کەئەمەش لەخوای کاربەجێ ناوەشێتەوە.

دوو : پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ (معصوم) بوونیشی‌دا خوا (جل جلاله) فەرمانی پێ کردووە کە لەو بڕیارانەدا کە (وەحی)یان لەسەر نیەو بۆ ڕاپەڕاندنی کاروبار ڕاوێژ بەهاوەڵانی بکات ﴿وشاورهم في الأمر..﴾ آل عمران (١٥٩)، جادیارە کەغەیری ئەو هەر کەسێك بێ جەوجار لەسەری پێویستە ڕاوێژ بکات ودوای پرس و ڕا پێ‌کردن و ڕاوێژی هاوەڵەکانی‌و هەڵبژاردنی کام ڕایە پەسندترو بەهێزترە ئەنجا بڕیار بدات، کەواتە دوای سەرکردە دەبێ ئەنجومەنێکی ڕاوێژ (مجلس شوری)یش هەبێ ئەوجار نۆرەی بەرنامە دێت.

سێ : ئێمە مەبەستمان لە بەرنامە لێرەدا خودی قورئان و سوننەت نیە، بەڵکو مەبەستمان ئەو بەرنامەو پەیڕەوەیە کە کۆمەڵێکی ئیسلامی لەسەری ڕێك دەکەون بۆ پەیڕەوی لێ‌کردنی تاکو ئەو ئامانجە شەرعی‌یانەی کە لەبەر چاویان گرتوون بیان هێنێتەدی، جابێگومان ئەو بەرنامەیەش دەبێ هەڵقوڵاوی قورئان و سوننەت بێ‌و گونجاو (متناسب)یش بێ لەگەڵ تواناو بڕست و قۆناغی کاری ئەو کۆمەڵەدا، دیارە ئەمەش لەدوای پێغەمبەر ﷺ کە لەڕێگای وەحی‌یەوە بەندو بڕگەکانی بەرنامەی بۆ دیاری دەکرا، تاقە لایەنێك کە دەسەڵات و ماف و شایستەیی ئەوەی هەبێ ئەنجوومەنی ڕاوێژ (مجلس

الشوری)یە بەسەرۆکایەتیی و لەژێر چاودێری فەرمانڕەواو برا گەورەیەکدا. دیارە هەرکام لەم (قید)انەش (شەرعی، ڕێك و ڕوون، گونجاو لەگەڵ قۆناغی کاردا) بێ حیکمەت دانەنراون و پێویستە بەوردی سەرنج بدرێن.

## ٤- پابەندی (إلتزام)ی موو بەمووی هەموو لایەك بە بەرنامەی کارەوە

﴿ثم جعلناك على شريعة من الأمر﴾

هەر بەرنامەیەك هەرچەندە تێرو تەواو بێ مادام پیادە نەکرێتو جێبەجێ نەکرێ، هیچی لێ هەڵناوەرێ، هەر بۆیەش خوای کاربەجێ پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)ی هەڵبژاردوون بۆ وەرگرتن و ڕاگەیاندنی پەیام و بەرنامەکانی خۆی کە چاکترین و شایستەترینی نێو بەندەکانیی و لەهەموو بەندە برواداروو چاکەکارەکانی خوا چاکترو زیاتر بەبەرنامەکانی خواوە پابەند بوون و پێش زمانی وتار بەزمانی کردار ئایینی خوایان ڕاگەیاندووەو ڕانواندووەو وەك پێویست و شایستەیە خوایان پەرستووەو بەرنامەکانیان بەڕێوە بردووە، بەشێوەیەك کە هەر کامێکیان تەرجەمەی کردەییو موجەسسەمەی ئەو پەیام و بەرنامەیەی خوا بوون کە پێیدا ڕەوانە کردوون، وەبێگومان ئەگەر وانەبوایە خەڵکی بیانووبڕاو نەدەبوون و (إقامة الحجة)یان لەسەر نەدەکرا، خوای میهرەبان و بەخشندە لەو بارەوە فەرموویەتی ﴿رسلا مبشرين ومنذرين لئلا يكون للناس على الله حجة بعد الرسل..﴾ النساء (١٦٥).

جابێگومان کۆمەڵێکی ئیسلامی کەدەیانەوێ بەڕێی پێغەمبەراندا بڕۆن و ئەرکی بەرزو پیرۆزی ئەوان دوای خۆیان جێبەجێ بکەن و بەرنامەی خوا لەژیانی خەڵکیدا بەرپا بکەن، دەبێ هەر کامێکیان لەزاتی خۆیداو وێکڕاش لەوپەڕی پلەی پابەندی دابن بەبەرنامەی خواوەو بەموو لێی لانەدەن، بەتایبەتی شەخسی سەرکردەو ئەوانەی دەوروبەری کە ئەنجوومەنی ڕاوێژی ئەو کۆمەڵە پێك دێنن.

## ٥- کار سپاردن بە ئەندامان لەسەر بناغەی شایستەیی‌و توانا

﴿وجعلنا منهم أئمة يهدون بأمرنا لما صبروا وكانوا بآياتنا يوقنون﴾

بەڵێ پێنجەمین بنەمای شەرعی هەر کۆمەڵێکی ئیسلامی ئەوەیە کە لەسەر بناغەی لێهاتوویی‌و لێوەشاوەیی کار بەئەندامانی خۆی بسپێرێ‌و بێجگە لەمە هیچ پێوەرێکی دیکە دەووری نەبێ لە کاری‌سپاردنی ئەنداماندا وەك خزمایەتی‌و ناوچەگەری‌و گوێ لەمستی‌و سینگ بردنە پێش و... هتد، چونکە هەم شەرع لەچەندان دەقی بێ پێچ و پەنادا فەرمان بەوە دەکات بۆ وێنە ﴿إن الله اصطفاه عليكم وزاده بسطة في العلم والجسم﴾ البقرة (٢٤٧) وە ﴿قال اجعلني على خزائن الأرض اني حفيظ عليم﴾ يوسف (٥٥) وە ﴿ياأبت استأجره إن خير من استأجرت القوي الأمين﴾ القصص (٢٦) وەك دەبینین هەر کام لەو سێ کارە (فەرماندەیتی جەنگی -طالوت - و سەرپەرشتی کاروباری ئابووریی -یوسف- و شوانێتی -موسى- عليهم السلام لەگەڵ دوو سیفەتدا باس کراون کە بنەمای راپەڕاندنی ئەو کارەن؛ فەرماندەیتی جەنگ زیاتر پێویستی بەجەستەی بەهێزو خۆڕاگرو زانیاری‌و هونەری جەنگ هەیەو، کاروباری ئابووریش بەبێ پارێزەریتی‌و زانیاریی ئابووری ڕاناپەڕێندرێ‌و، شوانێتیش هەم پێویستی بەهێزو تواناو هەم بە دەستپاکی‌و ئەمینداریتی دەکات!

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی (من استعمل رجلا على عصابة من المسلمين وفيهم من هو أرضى لله تعالى ورسوله منه فقد خان الله ورسوله والمؤمنين) رواه الطبراني بإسناد صحيح.

وەهەم بەعەقڵ و تەجرەبەی مێژووش ئیسپات بووە کە هەر گەل و کۆمەڵێك لەسەر بناغەی شایستەیتی کاروباریان بەم و بەو نەسپێررابێ، زوو دووچاری نەلاکەت و گێرەو کێشەو ناکۆکی بوو ون و بەرەو سەرئەنجامی شووم و بێ‌خێر چوو ون، هەر بۆیەش پێغەمبەری دڵسۆزو دووربینمان فەرموویەتی (إذا وسد الأمر إلى غير أهله فانتظر الساعة) رواه

البخاري[1]، واتـه: هـەر كـاتێك كاروبـار بەغـەیری خـەڵكی شایـستـەی خـۆی سـپێررا چاوەڕێی قیامەت بكە، دیارە ئەم ڕستەیەش (فانتظر الساعة) وەك زانایان فەرموویانە، هەم قیامـەتی گـەورەو هـەم قیامـەتی گچكـەش كـەكۆتایی‌و هـەرەس هێنـانی ئــەو كارەیــە دەگرێتەوە.

## ٦- گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەری (السمع والطاعة)ی بێ پێچ و پەنا بۆ براگەورە مادام بێ شەرعی نەبێ

﴿..وقالوا سمعنا وأطعنا غفرانك ربنا وإليك المصير﴾

شەشەمین بنەمای شەرعی هەرە گرنـگ و گـەورەی پێویـست بـۆ هـەر كـارو جـم و جۆڵێكی ئیـسلامی، بریتی‌یە لە گوێ‌گرتن و بەقسەكردن (السمع والطاعـة)ی قـاعیدە بـۆ قیادە، یان خواری بۆ سەری. وەبێگومان بەبێ ئەم بنەماو ئەسڵە شـەرعی‌یە كـە لەگـەڵێك دەقی قورئان و سوننەت دا داكۆكی‌ی لەسەر كراوە هیچ كارو چالاكی‌یەكی ئیـسلامی‌ی بەكۆمەڵ ئەنجام نادرێ، وە بەئەندازەی چەسپاوی‌و دامەزراوی ئەم بنەمایە لەهـەر كۆمـەڵ و بزووتنەوەیەكی ئیسلامی‌دا كارو چالاكی‌یەكان گـورج و گۆڵـترو خـێراتر ڕادەپـەڕن و بەپێچەوانەش بەپێچەوانەوە، هەر بۆیەش درووشمی هاوەڵانی بـەڕێزی پێغەمبـەر ﷺ خـوا لێیان ڕازی بێ كە نموونەی هەرە بەرزو تەواوی مـوسوڵمانەتی بوون بریتی بوو لە ﴿سـمعنا وأطعنا﴾، بەڵام درووشمی جوولەكەكان كەنموونەی نافـەرمانی‌و سـەرمەڕی‌و بێ‌گوێیین بریتی‌یە لە ﴿سمعنا وعصينا﴾ !!

بەڵام لێرەدا پێویستە دوو شت ڕوون بكرێتەوە:

---

[1] بڕوانە (رياض الصالحين) بەژمارە (١٨٤٦).

**یەك:** گوێ بۆ گرتن و بەقسەكردنی قاعیدە بۆ قیادە پێویستە دەست و بردو بێ پێچ و پەنا بێ‌و لەتەنگانەو فەرحانی‌و بێ‌خۆشبوون و بێ‌ناخۆشبوون (العسر واليسر والمنشط والمكره) دابێ، نەك تەنها لەكاتی خۆشی‌و ئاسایی‌و بێ خۆشبوون و كەیف لێبوون دا[1]!!

وەپێویستە مسوڵمانان دەرس و پەند لە جوولەكە وەربگرن كە زۆر بەخاوو خلیچكی ئەگەر فەرمانێكیشیان ئەنجام دابا ئەنجامیان دەدا، وەك لەبەسەرهاتی سەربڕینی مانگاكەدا زۆر ڕوون و ئاشكرا دیارە كە لەسوورەتی (البقرة)دا هاتووە.

وە لەكاتی تەنگانەو ناڕەحەتی‌داو مادام كەیفیان لێ نەبایە دادەنیشتن ، وەك لە سوورەتی (المائدة)دا خوای زانا لێیان دەگێڕێتەوە ﴿إذهب أنت وربك فقاتلا إنا هاهنا قاعدون﴾ ، یان پێچ و پەناو فرت و فێڵیان لەئەنجامدانی دەكرد، وەك ڕاوە ماسی‌ی ڕۆژی شەممە كە لەسوورەتی (الأعراف)دا لێیان دەگێڕێتەوە ﴿إذ تأتيهم حيتانهم يوم سبتهم شرعاً﴾.

**دوو :** ئەو گوێڕایەڵی‌و فەرمانبەرییە تەنها كاتێك لەسەر مسوڵمانان بۆ فەرماندەو برا گەورەیان پێویستە ئەگەر لەسنووری شەرع دا بێ‌و، فەرمانیان پێ نەكات بەكردنی شتێكی ناشەرعی، یان نەكردنی ئەركێكی شەرعی، چونكە كۆمەڵی ئیسلامی‌و كۆمەڵگای مسوڵمان پێویستە بەقیادەو قاعیدەوە ملكەچ و پابەندی ئایین و بەرنامەی خوا بن و، فەرمانڕەواش لەئیسلامدا شەرعیەتی حوكم و دەسەڵاتی خۆی بەگوێرەی بەرنامەی خوا وەرگرتووەو هەر لەو سنوورو جوغزەشدا گوێی لێ دەگیرێ‌و بەقسەی دەكرێ‌و، هیچكەس لە بێ‌فەرمانی خواو سەرپێچی بەرنامەكەیدا بەقسەی ناكرێ، وەك

---

[1] (عليك بالسمع والطاعة في عسرك ويسرك ومنشطك ومكرهك وأثرة عليك) رواه مسلم.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی (إنما الطاعة في المعروف)[1]رواه البخاري ومسلم، هەروەها فەرموویەتی (لاطاعة لمخلوق في معصية الخالق).

لێرەدا بەپێویستی دەزانم ئاماژە بۆ ڕاستی‌یەکی دیکەش بکەم کە زۆر کەس تێیدا بەهەڵە دەچن، ئەویش ئەوەیە کە فەرمانبەری‌و گوێڕایەڵی بۆ فەرماندەو برا گەورە فەرزەو، بە نەکردنی ئینسان گوناحبار دەبێ، هەروەك چۆن بە سەرپێچی‌و لاملی لەفەرمانی خواو پێغەمبەرﷺ گوناحبار دەبێ! کەواتە هیچ کەس نابێ وابزانێ کە بیستن و جێبەجێ‌کردنی فەرمانی برا گەورەو فەرماندەی شەرعی، شتێکە ئینسانی موسوڵمان تێیدا سەرپشك (مختار)ەو دەتوانێ بیکات یان نەیکات! پێغەمبەری خواﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی (من اطاعني فقد أطاع الله ومن عصاني فقد عصى الله، ومن يطع الأمير فقد أطاعني ومن يعص الأمير فقد عصاني) متفق عليه[2].

بەڵام دیسان لێرەش دا دەبێ وریابین و هەر کەس ڕاست بووەوە فەرمانێکی براگەورەیەکی بەدڵ نەبوو بۆی نیە بەبیانووی (ناشەرعی بوونی) سەرپێچی‌ی لێ بکات و بەقسەی نەکات، بەڵکو دەبێ ئەو فەرمانە ناشەرعی بوونەی ئاشکراو بێ پێچ و پەنا بێت و پێچەوانەی دەقێکی قورئان یان سوونەتی ڕاست (صحیح)ی پێغەمبەر یان بنچینەیەکی شەرعی بێت کە قورئان و سوننەت دەلالەتی لەسەر دەکەن.

---

[1] هۆی گوترانی ئەم فەرموودەیە ئەوەبوو کە پێغەمبەرﷺ کۆمەڵێك لە هاوەڵانی خۆی بۆ شوێنێك ناردو یەکێکی کردە فەرماندەیان و ئەویش دوای ئەوەی لەسەر شتێك لێیان تەڵس بوو فەرمانی پێ کردن دار کۆبکەنەوەو ئاگرێك بکەنەوەو پاشان فەرمانی پێ‌کردن بچنە نێوەو ئاگرەکەوە لەمەوە کێشەیان لێ‌پەیدا بوو ئایا بەقسەی بکەن و بچنە نێوی یان نەچن! جاکاتێك گەڕانەوە لای پێغەمبەرﷺ فەرمووی (لو دخلتموها ماخرجتم منها أبدا، إنما الطاعة في المعروف) بڕوانە (الأساس في التفسير) ی مامۆستا سەعید حەوا، ب٢، ل١١٠٣.

[2] بڕوانە (رياض الصالحين) ل٢٤٣.

کۆتایی ئەم باسەش بەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ دێنین کە دەفەرموێ (السمع والطاعة على المرء المسلم فيما أحب وكره ما لم يؤمر بمعصية، فإذا أمر بمعصية فلا سمع ولا طاعة) متفق عليه.

## ٧- پشت بەخوا بەستن و لەسەر پێی خۆ وەستان لەهەموو ڕوێکەوە

﴿وعلى الله فليتوكل المؤمنون﴾ ﴿فاستوى على سوقه﴾

بەڵێ ئەمیش حەوتەمین بنەماو ئەسڵی شەرعیی گەورەو گرنگی کارو جووڵانەوەی ئیسلامییەو، کۆمەڵی ئیسلامی بەبێ پشت بەخوا بەستن (التوكل على الله) ناتوانن درێژە بە کارو خەباتی ئیسلامییانەی خۆیان بدەن، چونکە سرووشتی پەیام و بەرنامەی خوا وایە -بەدرێژایی مێژووش هەروا بووە- کەدوژمن و ناحەزی زۆرن و چاویان پێی هەڵنایەت، لەسۆنگەی ئەوەوە کەتێکچوونی بازاڕی خۆیان و سەرنگوومی تەخت و تاجی خۆیانی تێدا دەبینن، وەك وەرەقەی کوڕی نەوفەل لەوەلامی پێغەمبەردا ﷺ کەدوای ئەوەی پێی گوت (ياليتني فيها جذعا أكون حيا حين يخرجك قومك) پرسی (أو مخرجي هم؟!) ئەویش گوتی (نعم لم يأت رجل قط بما جئت به إلا عودي)(١).

جا شوێنکەوتووانی بەرنامەیەکی ئاواو هەڵگرانی پەیامێکیوا جگە لەوەی کەئیمان و عەقیدەکەیان لەسەریان پێویست دەکات، سرووشتی ڕێبازو بەرنامەکەشیان ناچاریان

(١) أخرجه البخاري في صحيحه، وأخرجه مسلم في صحيحه أيضا. بڕوانە (السيرة النبوية الصحيحة) ی دکتور ضياء العمري، ب١، ل١٢٦.

دەكات كە تاقە پشت و پەناو جیٚی هانایان بەس خوا بیٚت و هیچ جۆرە ئومیٚدو چاوەڕوانی‌یەكیان بەكەسی دیكەو لەكەسی دیكە نەبیٚ.

ئاشكراشە كەمەبەست لەپشت بەخوا بەستن وازهیٚنان لەهۆیەكان (الأسباب)و دەست بەخۆدا بەردانەوە نیە، بەڵكو مەبەست دڵ بەس بەخوا بەستن و چاوەڕوانی تەنیا لەو كردنە، ئەگەرنا نابیٚ لە دابینكردنی هیچ هۆكاریٚك دا كە سەرگرتنی كارەكەی پیٚویستی پیٚیەتی دریٚغی بكات، دەنا گوناحبار دەبیٚ، هەروەك چۆن بەپشت بەخوا نەبەستن گوناحبارو باری لار دەبیٚ، ئنجا لەسەر پیٚی خۆ وەستان و متمانە بەخۆبوونی كۆمەڵی ئیسلامیش هەر بەرهەم و زادەی پشت بەخوا بەستن و دڵ بەخوا خۆشبوونیانەو بەبیٚ (توكل علی الله) لەسەر پیٚی‌خۆ وەستان لەخەیاڵ پڵاو بەولاوە چی‌تر نابیٚ!

بەڵیٚ! وابەستەیی‌و دابەستەیی لەكارو جم و جۆڵی ئیسلامی‌دا، ئەو كارە دەكاتە شتیٚكی قریٚژك و بۆش و جەستەیەكی دەرداژۆو نەخۆش، بۆیە دەتوانین بڵیٚین: پشت بەخوا بەستن (التوكل علی الله) بۆ كاری ئیسلامی لەجیٚگای هەویٚنە بۆ شیرو هەروەك چۆن شیری بیٚ هەویٚن سەرەنجام هەڵدەبزڕكیٚ‌و دەبیٚ فڕیٚ بدریٚ، كارو خەباتی ئیسلامیش ئەگەر لەسەر ڕەگ و ڕیشەی خۆی نەوەستیٚ‌و پشت بەپەروەردگاری خۆی نەبەستیٚ هیچی لیٚ هەڵناوەریٚ!

كەواتە: هەر كۆمەڵ و بزووتنەوەیەكی ئیسلامی بیەویٚ واقیع بگۆڕیٚ نەك واقیع بیگۆڕیٚ! دەبیٚ زۆر بەجیددی سەربەخۆیی‌و ئازادی‌ی خۆی بپاریٚزیٚ لەهەموو بوارەكانی فیكری‌و سیاسی‌و ئابووری‌و... هتدداو بەهیچ كلۆجیٚك نەهیٚڵیٚ بدۆڕیٚ ئەگەرچی لەو پیٚناوەشدا ئازاری زۆریش بكات و خویٚنی زۆریشی لیٚ بچۆڕیٚ!

لەكۆتایی ئەم بەشی یەكەمەش دا بەپیٚویستی دەزانم ئەم ڕاستی‌یە ڕابگەیەنم كە لەزۆر جیٚگای دیكەشدا گوتوومەو تەئكیدم كردۆتەوە، ئەویش ئەوەیە كە:

هەروەك چۆن هەرچی خەسڵەتی نزم و پەستە هەموویان زادەو بەرهەمی کوفر یان ئیمانکزیەو دوور لەخواییین[1]، هەرچی خوو وخدەو خەسڵەتی جوان و ڕەندو بەرزو پەسندیش هەیە هەموویان بەرو میوەی درەختی ئیمانن، کەواتە:

بۆ ئەوەی هەرچی زیاتر سەقامگیربوونی خەسڵەتە بەرزو پەسندەکانی وەك: کار بەراوێژو پابەندی بەبەرنامەوە گوێڕایەڵی و فەرمانبەریەو پشت بەخوا بەستن و لەسەر پێی خۆ وەستان و یەکتر خۆشویستن و ڕێزی یەکتر گرتن و... هتد لەنێو کۆمەڵ و بزووتنەوەیەکی ئیسلامیدا مسۆگەر بکەین پێویستە کاری جیدیەو شێلگیرانە بکەین بۆ گەشە پێدان و قووڵکردنەوەو دامەزراندنی ئیمان و عەقیدە لە عەقڵ و دڵی تیادەو قاعیدەدا بەو شێوازەی کە قورئان ڕوونی کردۆتەوەو پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵە بەڕێزەکانی خۆی بەتایبەتی ﴿السابقون الأولون من المهاجرين والأنصار﴾ ی لەسەر پەروەردە کردن و پێگەیاندن رضي الله عنهم وأرضاهم أجمعين.



---

[1] دیارە مەرج نیە هەر کەسێك یەکێك یان زیاتر لەو خەسڵەتانەی تێدابوون کافری موتڵەق بێ! نەء بەڵام بێگومان خەلەل و کەم و کووڕی لەئیمان و عەقیدەکەیدا هەبەو بەجۆرێك لەکوفری گچکەوە گیرۆدە بووە، خوای زاناش فەرموویەتی ﴿فلا تخافوهم وخافون إن كنتم مؤمنين﴾ آل عمران (١٧٥)، واتە ئەگەر ئیمانداری کامڵن!

# بەشی دووەم
# بنچینەكانی هەڵس و كەوت
# (قواعد التعامل)

بەڕێزان، خوشك و برایانی سەر بە بزووتنەوەی ئیسلامی!

دوای ئەوەی لەبەشی یەكەم دا بنەما شەرعی‌یە سەرەكی‌یەكانی هەر كۆمەڵ و بزووتنەوەیەكی ئیسلامیمان خستەڕوو، تاكو لێمان حاڵی بێ بزووتنەوەی ئیسلامی تاج ئەندازەیەك بەپێی شەرع بەڕێوە دەچێ! وەلەكوێ‌تو كوێدا كەم و كووڕی‌و كرچ و كاڵی هەیەو پێویستی بەچارەسەر هەیە، لەم بەشەش دا لەدوو بەندی سەرەكی‌دا شێوازی ڕەفتارو ئەو بنچینانەی كە دەبێ بۆ هەڵس و كەوت لەگەڵ خەڵك و دەوروبەردا ڕەچاو بكرێن دەخەینەڕوو، بەڵام لێرەدا دەمەوێ ئەو ڕاستی‌یە تەئكید بكەمەوە كە پێشتریش ئاماژەم بۆ كرد، كەهەرچەندە هەر كامێكمان بەشەخسی هەتا ڕاددەیەكی زۆر دەتوانێ - ئەگەر بیەوێ- شەرع چۆنی فەرمووە ئاوا لەگەڵ هەموو چین و توێژەكانی كۆمەڵگادا ڕەفتار بكات، بەڵام هەموومان وەك (بزووتنەوەی ئیسلامی) بەس كاتێك دەتوانین لەئاستی بەرنامەو شەرعی خوادا لەگەڵ دەوروبەرمان دا هەڵس و كەوت بكەین كە بزووتنەوەیەكی ڕاست و ساغ بین و، قیادەو پاشانیش قاعیدە بەتەواوی پابەندی بنەما شەرعی‌یەكان بن! ئەگەرنا عارەب گوتەنی (فاقد الشئ لایعطیه) وە (من لم یكن لنفسه فكیف یكون لغیره!).

كەواتە:

هەتا خۆمان (قیادەو قاعیدە) بەو شێوەیە لێ نەكەین كەشەرع لێی داوا كردووین و دەستوورو یاساكانی شەرع بەتەواوی مەعنا بەسەر خۆماندا نەچەسپێنین و حەقیقەتەكانی ئیمان و ئیسلام و ئیحسان هەزم نەكەین و لەگەڵ قورئان و سوننەت دا تەفاعول نەكەین،

بادڵنیا بین کە بەرەو پێش چوون و گەشەکردنمان مەحاڵەو خەڵك چاككردن و واقیع گۆڕینمان خەون و خەیاڵە! نەك هەر ئەوەندە بەڵكو دەبێ زۆریش مەترسی ئەوەمان هەبێ کەخوای دەوڵەمەندو بێ‌نیاز لێمان تووڕە بێ‌و، لەسەر ئەو بەرنامە تێرو تەواوو چاك و پاکە وەدەنگ بێ، کەتیمە ئاڵاو درووشمیمان بەرز کردۆتەوە، بەڵام بۆی بووینە ئاوێنەیەکی تڵخ و ژەنگاویو خەریکین لەبەرچاوی خەڵکی لەجیاتی شیرینکردن ناشیرینی دەکەین و، ئەوانیش سەرەنجام لێی دەسڵەمنەوەو لێشی دڕدۆنگ دەبن و، ئاوا لەئاکام دا لەباتی ئەوەی بەڵگەی ئیسپاتی ڕاستیو تەواوی ئیسلام بین بەسەر خەڵکەوە وەك خوا فەرموویەتی ﴿وكذلك جعلناكم أمة وسطا لتكونوا شهداء على الناس﴾ البقرة (١٤٣)، بەپێچەوانەوە بینە بەڵگەی دەستی خەڵکی لەسەر ئیسلام ﴿ شهداء للناس!﴾، کەدیارە سەرەنجامێکی ئاوا شوومیش بۆ کۆمەڵ و بزووتنەوەیەکی ئیسلامی ڕووزەردیو سەرشۆڕی بەردەم خواو خەڵکی‌یە لەدنیاو دواڕۆژداو هەر کەسێك تۆسقاڵێك بەتەنگ قیامەت و دواڕۆژی خۆیەوە بێ پێی ڕازی نابێ‌و هەموو هەوڵی دەخاتەکار کە دووچاری نەبێ.

## پوختەی مەبەست :

ئەم بەشی دووەمە -هەڵس و کەوت کردنی شەرعی‌یانە لەگەڵ خەڵك دا- زادەو بەرهەمی بەشی یەکەمە بەبێ‌وی ئایەتەدی.

دیارە هۆی دابەشکردنی ئەم بەشی دووەمەش بۆ دوو بەند ئەوەیە کە لەبەندی یەکەم دا هەڵوێستی بزووتنەوەی ئیسلامی لەڕووی عەقیدەیی‌و مەبدەئی‌یەوە لەبەرانبەر کۆمەڵگاو چین و توێژەکانی‌دا بخەینەڕوو، وە لەبەندی دووەمیش دا لەڕووی کردەیی‌و ڕەفتارو ئاکارەوە شێوەی شەرعی‌ی هەڵس و کەوتی بزووتنەوەی ئیسلامی لەگەڵ دەوروبەری‌دا ڕوون بکەینەوە.

## بەندی یەکەم

# هەڵوێستی مەبدەئی لەئاقار کۆمەڵگەدا

ئەم مەسەلەیە لەچەند خاڵێك دا دەتوێژینەوە:

(١)

بزووتنەوەی ئیسلامی بەس ئیسلام کە قورئان و سوننەت سەرچاوەی ڕوون و بێ‌چەندو چوونی بەشایستەی ئەوە دەزانێ کەبەرنامەی ژیان و گوزەرانی تاك و کۆمەڵ بێ لەهەموو بوارو لایەنەکانی‌دا، چونکە خوای پەروەردگار فەرموویەتی ﴿.. الیوم أکملت لکم دینکم وأتممت علیکم نعمتي ورضیت لکم الأسلام دینا..﴾ المائدة (٣).

(٢)

بزووتنەوەی ئیسلامی هەموو بەرنامە مرۆڤکردەکان بێ‌جیاوازی لەنێوانیان دا بە (کوفر) دەزانێ، چونکە هیچ کامیان مۆری تەئیدی خوای دادگەرو فەرمانڕەوایان پێوە نی‌یە، بۆیە سەرجەمیان بە بەرنامەی کوفرو حوکمی نەفامی لەقەڵەم دەدرێن، چونکە بەرنامەو حوکم بەگشتی دوو جۆرن؛ (أ) حوکم و بەرنامەی خوا، (ب) حوکم و بەرنامەی نەفامی، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی ﴿أفحکم الجاهلیة یبغون؟ ومن أحسن من الله حکما لقوم یوقنون﴾ المائدة (٥٠). دیارە لەئیسلامیش دا (حوکم و عیبادەت و دین) هەر یەك شتن ولەیەك جودا نین، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی ﴿..إن الحکم إلا لله أمر ألا تعبدوا إلا إیاە ذلك الدین القیم ولکن أکثر الناس لایعلمون﴾ یوسف (٤٠). واتە: فەرمانڕەوایەتی بەس نی خوایە، فەرمانی کردووە کەبەس ئەو بپەرستن، ئائەوە ئایینی ڕاستە، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن!

بەڵێ! ئاینی تەواو ئەوەیە کەئەو زاتەی بەس خۆی شایستەی بەندایەتی بۆ کران و پەرسترانە -کەخوای پەروەردگارە- هەر ئەویش حاکم و فەرمانڕەوا بێت.

(٣)

دیارە هەر کەسێکیش ئیسلامی ناسیبێ، یان توانیبی بیناسێ بەڵام ئیهمالی کردبێ و پشتی تێکردبێ، کەچی بڕواو قەناعەتی بەڕاستی و تەواوی یەکێك لەو بەرنامانە بێت و پێی لەئیسلام چاکتر یان وەك ئیسلام بێ، ئەوە شوێنیان بکەوێ یان نا بەکافر دادەنرێ، وەك خوای بەرزو زانا فەرموویەتی ﴿ومن يبتغ غير الإسلام ديناً فلن يقبل منه وهو في الآخرة من الخاسرين﴾ آل عمران (٨٥).

(٤)

هەروەها هەر کەسێك ئینکاری ڕاستیی یەك باساو حوکمی ئاشکرای ئیسلام بکات کەزاناو پێشەوایان بە (إنكار ماعلم من الدين بالضرورة) تەعبیریان لێداوەتەوە، یان گاڵتەو گەمە بەشتێك لەشتەکانی ئیسلام بکات یان هەر کردەوەو ڕەفتارێك ئەنجام بدات کە بەڕاشکاوی کوفری لێ بفامرێتەوە، وەك سوجدە بردن بۆ سەنەم، یان خاچ کردنە مل... ئەوا بەکافر لەقەڵەم دەدرێ، خودای دادگەر فەرموویەتی ﴿ولئن سألتهم ليقولن إنما كنا نخوض ونلعب! قل أبالله وآياته ورسوله كنتم تستهزءون؟! لاتعتذروا قد كفرتم بعد إيمانكم..﴾ التوبة (٦٥-٦٦).

بەڵام لێرەدا دەبێ وریا بین و لەدوو حاڵەتدا بەهەڵەدا نەچین:

یەك : هەرچەندە قسەیەك یان بیروبۆچوونێك یان هەڵوێستێك و ڕەفتارێك خۆی لەخۆیدا (کوفر) بێت، ناتوانین بێ سێودوو هەر کەسێك ئەو قسەو بۆچوون و ڕەفتارەمان تێدا بینی یەکسەر حوکمی (کافر بوون)ی بەسەردا بدەین، چونکە زانایانی ئیسلام هەموویان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە جاریوا دەبێت قسەیەك یان کردەوەیەك کوفرە، بەڵام خاوەنەکەی بەکافر داناندرێ، چونکە بەکافر دانانی هەر ئینسانێك دەبێ

هەم پێویست کەرەکان (موجبات)ی هاتبێتەدی‌و هەم بەربەرچەکان (موانع)ی لاچووبن، کەزاناکان بە (ثبوت الشروط وانتفاء الموانع) تەعبیری لێدەکەنەوە بۆیە: کەسێك پەیام و بانگەوازی ئایینی خوای بەرووونی پێ نەگەیشتبێ‌و کەمتەرخەمیشی نەکردبێ لەوەدا، ئەوا هەرچەندە ئینکاری شتێك یان زیاتر بکات لەوانەی کە ئینکاری کردنیان کوفرە وەك: فەرزبوونی نوێژو رۆژوو، یان حەرام بوونی شەراب و دزی، بەکافر دانانرێ هەتا لێی حالی نەکرێ‌و بۆی روون نەکرێتەوە، دەقی قورئان و سوننەتیش لەو بارەوە زۆرو زەوەندن بۆوێنە: خوای کاربەجێ فەرموویەتی ﴿وما كنا معذبين حتى نبعث رسولا﴾ الإسراء (١٦٥) کەواتە دیارە بەر لەوەی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) ئەرکی مژدەدان و ترساندن ئەنجام بدەن خەڵکی بەلگەو بیانوویان بەدەستەوە هەیە بۆ بەهەنایەتی نەکردن!

پێغەمبەریش ﷺ بەسەرهاتێکمان بۆ دەگێڕێتەوە کە بەهێزترین بەڵگەیە بۆ ئیسپاتی ئەم مەسەلەیە، ئەمەش دەقی فەرموودەکەیە کە هەرکام لە (بوخاری و موسلیم) گێڕاویانەتەوەو ئەمە ڕیوایەتەکەی (موسلیم)ە:

عن أبي هريرة أن رسول الله ﷺ قال (قال رجل لم يعمل حسنة قط لأهله: إذا مات فحرقوه، ثم أذروا نصفه في البر ونصفه في البحر، فوالله لئن قدر الله عليه ليعذبنه عذابا لايعذبه أحدا من العالمين. فلما مات الرجل فعلوا ما أمرهم، فأمر الله البر فجمع مافيه وأمر البحر فجمع مافيه، ثم قال: لم فعلت هذا؟! قال: من خشيتك يارب وأنت أعلم فغفر الله له)[1].

وەك دەبینین ئەو کابرایە ئینکاری دەسەڵاتی خوای کردووە کە بتوانێ زیندووی بکاتەوە دوای سوتێنران، کەچی خوا لێی خۆش بووە، چونکە ئینکاری کردنەکەی لەنەزانی‌و بێ‌ئاگایی بووە!

[1] هەروەها بڕوانە (مجموع فتاوى شيخ الأسلام ابن تيمية) ب٣، ل٢٣١، وەبڕوانە (العقيدة الأسلامية في القرآن ومنهاج المتكلمين) ی دکتور محمد عياش الكبيسي،ل٢٣.

تێبینی، لەبەشی سێیەمی (پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامی)دا بەناوی (بیروباوەڕ) لەبەندی پێنجەم دا باسێکی خەست و خۆڵمان لەم بارەوە کردووە بەناوی (چۆنیەتی کافربوونی ئینسان و هەڵوەشانەوەی شایەتمان)، پێویستە سەرنجی بدرێ بۆ زیاتر بەرچاو ڕوون بوونەوەو بەعەمەلدانەچوون[1].

**دوو**، هەرچەندە هەموو موسوڵمانێك لەسەری فەرزە کە بەس موسوڵمانان و بڕواداران بەدۆست و پشتیوان بگرێتەوە، هەموو ئەوانەی کە کافرو بێبڕوان، یان بەدوای وان کەوتوونە بەدوژمن و ناحەزی خۆییان بزانێ، بەڵام مەرج نیە هەموو ئەوانەی کە لە بەرە (جبهە)ی باگڵ و کوفر دان و ڕەگەڵ کافران کەوتوون کافر بن و حوکمی کافربوونیان بەسەردا بچەسپێ، چونکە لەگەڵ کافران دا بوون و دۆستایەتی کردنیان بەلای کەمەوە سێ حاڵەتی هەن، کەلەحاڵەتی یەکەمیان دا بەکوفرو، لەحاڵەتی دووەم دا بەگوناحی گەورەو، لەتی سێیەمیشیان دا بەس بەگوناحی گچکە لەقەڵەم دەدرێ.

جا لەبەر ئەوەی سوپاس بۆ خوا ئێمە تاڕادەیەکی باش مەسەلەی دۆستایەتیو دوژمنایەتی (الموالاة والمعاداة)مان لەکتێبی (پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامی)دا ڕوون کردۆتەوە[2]، لێرەدا بەپێویستی نازانم زۆری لەسەر بڕۆم، بەڵام ئاماژە بۆ چەند دەقێکی قورئان دەکەم کەزۆر بەڕاشکاوی ئەم مەسەلەیان خستۆتەڕوو، -واتە ئەوە کە دۆستایەتیو لەگەڵ کافران دا بوونێك ئینسانی پێ کافر نابێو دیارە کوفریش نیە-. بۆوێنە:

أ- خوای زاناو میهرەبان دەربارەی پیاوێك کە بە (مؤمن آل فرعون) ناسراوە ئەفەرموویەتی ﴿وقال رجل مؤمن من آل فرعون يكتم إيمانه أتقتلون رجلا أن يقول ربي

---

[1] بڕوانە لاپەڕە(٨٤) تا (١٠٢)ی سەرچاوەی ناوبراو.

[2] بڕوانە سەرچاوەی ناوبراو بەشی نۆیەم (دۆستانی پشتیوان) و بەشی دەیەم (دوژمن و ناحەزان) لاپەڕە (١٩٩) تا (٢٢٤).

الله...﴾ غافر (٢٨)، وەك دەبينين خواى دادگەر ئەو پياوەى بەبڕوادار ﴿مؤمن﴾ ناوبردووەو مەدحيشى كردووە هەرچەندە ئيمانەكەشى شاردۆتەوە ﴿يكتم إيمانه﴾! وەهەرچەندە يەكێك بووە لەپياوانى نێو دام و دەزگاى حوكمى فيرعەون!!

ب- هەروەها خواى ميهرەبان دەربارەى كەسانێك لەخەڵكى مەككە كەبڕوايان هێنابوو بەڵام ئامادە نەبوون يان لەبەر هەر هۆيەك بێ كۆچيان نەكردبوو بۆ مەدينەو، هەر لەژێر ڕكێفى سەرانى كوفردا لەمەككە مابوونەوە، فەرموويەتى ﴿إن الذين آمنوا وهاجروا وجاهدوا بأموالهم وأنفسهم في سبيل الله والذين آووا ونصروا أولئك بعضهم أولياء بعض، والذين آمنوا ولم يهاجروا مالكم من ولايتهم من شيء حتى يهاجروا..﴾ الأنفال (٧٢)، وەك دەبينين كەسانێك كەلەژێر ڕكێف و دەسەڵاتى كافرو بت پەرستەكانى مەككەدا ژياون و ئامادەى كۆچكردن (هجرة) نەبوون خودا بەبڕوادارى حيساب كردوون، ئەوەندە هەيە لەبەر كۆچ نەكردنەكەيان لە دۆستايەتىو پشتگيرىو بەرگرى لێكردنى موسڵمانان بێبەشى كردوون لەكاتێكدا ئەو پشتگيرىيە سەريكێشێ بۆ شكاندنى پەيمانى نێوان كۆمەڵى موسڵمان و كۆمەڵى كافرا

ج- وە لەسوورەتى (الفتح) ئايەتى ژمارە (٢٥)دا خواى كاربەجێ لەباسى حيكمەتى هێنانەپێشى گيرانى مەككەدا بەشێوەيەكى هێمن و بەبێ كوشت و كوشتار فەرموويەتى ﴿..ولولا رجال مؤمنون ونساء مؤمنات لم تعلموهم أن تطؤوهم فتصيبكم منهم معرة بغير علم ليدخل الله في رحمته من يشاء لو تزيلوا لعذبنا الذين كفروا منهم عذابا أليما﴾ ، وەك دەبينين خواى ميهرەبان و بەخشندە بەئاشكرا دەفەرموێ كە بۆيە گيران و ئازادكردنى شارى مەككەمان ئاوا هێنانەو بێ كوشتار هێنايە پێش چونكە پياوان و ئافرەتانێكى بڕوادار لەمەككەدا هەبوون كە ئێوە پێتان نەدەزانين! نەوەك بەدەستى ئێوە نووشى زيانێك ببن! پاشان دەفەرموێ: ئەگەر لێك هەڵاوێررابان و بڕوادارو كافرەكان لەيەك جيا بكرابانەوە، ئەوا كافرەكانيانمان بەتوندى ئازار دەدا -كەمەبەست كوشتنيانە بەدەستى پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانى -.

د- زۆر لەتوێژەرەوانی قورئان فەرموویانە ئەم ئایەتە ﴿وما كان لمؤمن أن يقتل مؤمنا إلا خطأ..﴾ النساء (٩٢) دەربارەی ئەو موسڵمانە هاتۆتە خوار کە بەزۆر یان هەر شێوەیەکی تر ڕەگەڵ سوپای کوفر دەکەوێتو پاشان لەجەنگ دا بەدەستی موسڵمانان دەکوژرێ[1]!

کۆتایی ئەم باسەش بەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ دێنین:

عن أم المؤمنين عائشة رضي الله عنها قالت: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم (يغزو جيش الكعبة فإذا كانوا ببيداء من الأرض يخسف بأولهم وآخرهم، قالت: قلت يارسول الله كيف يخسف بأولهم وآخرهم وفيهم أسواقهم ومن ليس منهم؟! قال: يخسف بأولهم وآخرهم ثم يُبعثون على نياتهم) متفق عليه[2].

کەواتە: ئینسان ئەگەر لەگەڵ سوپایەکیش بێ کە بۆ ڕووخاندنی (کەعبەی پیرۆز) دەچن بەڵام بەناچاری یاخود نەزانی ڕەگەڵیان کەوتبێ، تەنها بەلەگەڵبوونی ئەوان حوکمی کوفری بەسەردا نادرێتو بەر هەڕەشەی خوا ناکەوێ[3]!!

جا ئێستا ڕاددەی سادەیی و سەرکێڵی و لەئیسلام حاڵی نەبوونی ئەو کەسانەمان جوان بۆ ئاشکرا بوو کەهەروا بەشێنایی و بەبەلاش هەرچی بەدڵیان نەبوو کافری دەکەن و، هەموو ئەوانەی کە گیرۆدەی حیزبێکی عەلمانی بوون کەبەرنامەکەی کوفرە، بێ سێودوو و لێکۆڵینەوە لەحاڵ و وەزعیان داخوا چۆن و لەبەرچی و لەژێر چ فشارێکدا گرفتار بوو ون، بەکەمەر حوکمی کافرێتی و لەدین وەرگەڕانیان دەردەکەن و هەموویان

---

[1] بڕوانە (مجموع فتاوى شيخ الإسلام) ب١٩، ل٢٢١.

[2] بڕوانە (رياض الصالحين) ل٥.

[3] دیارە مەسەلەی ڕەوابوونی کوشتنی ئەو جۆرە موسڵمانانەی کە بەهەر هۆیەکەوەبێ ڕەگەڵ بەرەی کوفرو باگەل دەکەون شتێکی بەلگە نەویستەو جێگای مشت و مڕ نیەو دەیان دەقی قورئان و سوننەتی لەسەرن. ([illegible])

بەیەك چاو سەیر دەكەن و یەك حیسابیان بۆ دەكەن! بێ ئاگا لەوەی كەئەو جۆرە كەسانە تیایاندا هەیە كافرە چونكە لەرووی قەناعەت و بڕوایێبوونەوە ڕەگەڵ كەوتووە، هەشیانە لەبەر نەزانیو بێئاگاییو، هەیانە لەترسان و لەبرسان و... هتد[1] كەبێگومان هەر كام لەمانە حوكمی تایبەتی خۆی هەیەو ناگونجێ یەك جۆرە حوكم بەسەر هەموویان دا بگشتێنرێ، چونكە یەك حاڵەتیان نیە تاكو یەك حوكمی شەرعی هەموویان بگرێتەوە، پێشینانیش گوتوویانە (مەڕ بەپێی خۆی هەڵدەواسرێو بزنیش بەپێی خۆی).

بەندی دووەم

# ڕەفتارو ئاكارمان لەگەڵ دەوروبەردا

دیارە مەگەر بەدەگمەن ئەگەرنا ڕەفتارو كرداری هەر گەل و كۆمەڵێك زادەو هەڵقوڵاوی بیروبۆچوون و لەناعەتیانە، كەواتە هەر كاتێك هەڵەو كەم و كووڕی لە بیروبۆچوون دا هەبوو بێگومانە كە لەعەمەل و كەوتیش دا دەبێ، چونكە گۆزە چی تێدابێ هەر ئەوەشی لێ دەڕژێ، بۆیە بەپێویستم زانی لەبەندی یەكەم دا لەڕووی مەبدەئیو تیۆریەوە هەڵوێستی كۆمەڵێكی ئیسلامیی وەك بزووتنەوەی ئیسلامی دەربارەی كۆمەڵگا بخەمەڕوو، تاكو لێرەدا شێوەی هەڵس و كەوت و ڕەفتاری ئەو كۆمەڵە موسڵمانە لەگەڵ دەورو بەریان دا ئاسانتر دیاری بكرێ. جا باسەرنج بدەین داخوا ئەو

---

[1] دیارە ئەو نەزانیو بێ ئاگاییو ترسان و برسیەتیو... هتد پێویستە ئەم مەرج و (قید)انەیان تێدا ڕەچاو بكرێن كە شەرعزانان بەوردیو ڕوونی لە كتێبەكانیاندا باسیان كردوون، نەك هەر بۆرە نەزانیو برسیەتیو ترسانێك.

یاساو بنچینه شەرعی‌یانە چین کە بەهایەندبوونمان پێیانـەوە دەتوانـین هـەڵس و کـەوتێکی شەرعی‌یانەی ڕاست و درووست لەگەڵ کۆمەڵگای کوردەواری خۆمان دا بکەین!

خوا پشتیوان بێ ئەم باسە لەدوو خاڵان دا دەتوێژینەوە:

١- چەند بنچینەیەکی گشتی دەخەینەڕوو کەبازنەو جوغزی هەڵس و کەوتی تاك و کۆمەڵی مسوڵمان لەگەڵ دەورویەریان دا دەخەنەڕوو.

٢- کۆمەڵگای کوردەواری بۆ سێ بەش دابەش دەکەین و، چۆنیەتی هەڵس و کەوت لەگەڵ هەر کامێکیان دا ڕوون دەکەینەوە.

## ١- ڕەوشتە بنچینەیی‌یەکانی هەڵس و کەوتی تاك و کۆمەڵی مسوڵمان لەگەڵ دەوروبەردا:

ئاشکرایە کەئەخلاقی بەرزو ڕەوشتی جوان لەمەیدانی هەڵس و کەوت دا ئیمتیازی هەرە گەورەو گرنگی ئینسانی مسوڵمان و کۆمەڵی مسوڵمانەو درووشم و نیشانەی هەرە زەق و بەرچاویانە کەپێی دەناسرێن و لەغەیری خۆیان جوێ دەکرێنەوە، دەقی قورئان و سوننەتیش لەو بارەوە یەکجار زۆرن بۆوێنە:

- خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی ﴿..وقولوا للناس حسنا..﴾ البقرة (٨٣)، هەروەها فەرموویەتی ﴿..وأحسنوا إن الله يحب المحسنين﴾ البقرة (١٩٥) ، دیارە قسەی باش و کرداری باشیش هەموو ڕەوشتی بەرزو جوان لەنێو خۆیان دا دەگرن.
- پێغەمبەری پێشەواشمان[redacted] فەرموویەتی (إن من خيـاركم أحاسنكم أخلاقا) متفق عليه، هەروەها فەرموویەتی (مامن شيء أثقل في ميزان العبد المؤمن يوم القيامة من حسن الخلق) رواه الترمذي وقال حسن صحيح، هەروەها فەرموویەتی (أكمل المؤمنين إيمانا أحسنهم خلقا) رواه الترمذي وقال حسن صحيح، هەروەها فەرموویەتی (ان المؤمن ليدرك بحسن خلقه درجة الصائم القائم) رواه أبو داود، دیسان

فەرموویەتی (إن من أحبكم إلي وأقربكم مني مجلسا يوم القيامة أحاسنكم أخلاقا) رواه الترمذي وقال حسن.

وەك لەم فەرموودانەدا دەردەكەوێ، خوو و ڕەوشتی بەرزو پەسند:

- مایەی چاكێتی‌یە لەلای خواو پێغەمبەر ﷺ .
- قورسترین شتە لەتەرازووی بەندەدا لەرۆژ ی دوایی!
- نیشانەی كامڵ بوونی ئیمانەو تەرازوو و پێوەریەتی!
- بەخوو و ڕەوشتی بەرزو جوان بەندەی موسوڵمان دەگاتە پلەی زۆر ڕۆژووگری شەونوێژ كەرا
- مایەی خۆشەویست بوون و نزیكی‌یە لە پێغەمبەر ﷺ لەرۆژی دوایی‌دا!

جادبارە خوو و خدەی نەرم و پەستیش ڕاست بەپێچەوانەی خوو ورەوشتی بەرزەوەیەو، هەر بۆیەش هەروەك چۆن لەقورئانی‌دا خوای زانا بەندە خواپەرست و باشەكانی خۆی بەئەخلاقی بەرزو پەسند وەسف دەكات، دوژمن و ناحەزانیشی بەپێچەوانەوە بەئاكاری ناقۆڵاو بەد ڕەفتاری پێناسە كردووە، هەڵبەتە ئەمەش شتێكی سرووشتی‌یە چونكە ئیمان سەرچاوەی (فضائل)و كوفریش كانگای (رذائل)ە!

ئێستاش بالەچەند خاڵێك دا ژمارەیەك لەو بنچینە ئەخلاقی‌یە گشتی‌یانە بخەینەڕوو كە تاك و كۆمەڵی موسوڵمان لەهەڵس و كەوتی لەگەڵ دەوروبەریان دا پێیانەوە پابەند دەبن:

یەك، قسەی چاك وكردەوەی چاك ﴿وقولوا للناس حسنا﴾ و ﴿وأحسنوا..﴾، جادیارە كە جنێودان و زمان شڕیو نەفرین و تانەو تەشەرو هەڵوێستی سووك نە بەقسەی باش و نەبەكردەوەی چاك دانانرێن، بۆیە لەمرۆڤی موسوڵمان و كۆمەڵی موسوڵمان ناوەشێتەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (ليس المؤمن بالطعان ولا اللعان ولا الفاحش البذي) رواه الترمذي وقال حسن.

**دووه:** خۆ مەرزەم کردن لەکاتی تووڕەیی‌داو ڕق قووت دانەوەو لێبووردن ﴿والكاظمين الغيظ والعافين عن الناس..﴾ آل عمران (١٣٤)، کەواتە: مسوڵمان نابێ تەنگەبڕنەکەو کەم چیکڵدانەو تووڕەو تووش و بەکینەو غەرەز بێ.

**سێ:** دادگەریەو ویژدان و لەمەق لانەدان ﴿ولايجرمنكم شنآن قوم على ألا تعدلوا إعدلوا هو أقرب للتقوى..﴾ المائدة (٨)، بەڵێ! مسوڵمانان ئەگەر دوژمنیش هەقی بەدەست بێ دانی پێدا دێنن و نکوولی لێ ناکەن.

**چوار:** لەئاقار خراپەدا چاکە دەکات و پێی بەرپەرچ دەداتەوە ﴿إدفع بالتي هي احسن السيئة..﴾ المؤمنون (٩٦)، دیارە کەسێکیش بیەوێ خەڵک بانگ بکاتە لای خوا دەبێ ئیمتیازو زیادی‌یەکی تێدابێ‌و، کارێك بکات منەتبارو قەرزداری بن.

**پێنج:** لەبەرانبەری هەر چاکەیەك دا چاکتر یان لانی کەم وەك خۆی ڕەفتار دەکەن ﴿وإذا حييتم بتحية فحيوا باحسن منها أو ردوها﴾ النساء (٨٦)، بەڵێ! دەبێ مسوڵمانان چ تاك چ کۆمەڵیان هەمیشە لەخەڵکی بەرانبەریان چاکترو بەڕێزو حورمەتتر بن و هەوڵ بدەن هەمیشە دەستی ئەوان لەبواری چاکەو پیاوەتی‌و ڕەفتار پەسندی‌دا لەمەی خەڵکی درێژتر بێت و، هەمیشە دەستی بەرزو بەخشەر بن، چونکە (واليد العليا خير من اليد السفلى) رواه مسلم.

**شەش:** خەڵك بانگکردنە لای بەرنامەی خوا بەدانایی‌و ئامۆژگاری باش و موناقەشە بەچاکترین شێوە ﴿أدع إلى سبيل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة وجادلهم بالتي هي احسن﴾ النحل (١٢)، بەڵێ! مسوڵمان وەستاو دانایەو دەزانێ لەچ کات و شوێنێك دا چ قسەیەك دەکات و چۆن و بۆچی؟ وەلەمرووی بەزەیی‌و پەرۆش و خێرخوایی‌یەوە ئامۆژگاری دەکات و، هەر کاتێکیش ناچار بوو شەڕەقسە بکات، بەچاکترین شێواز دەیکات و بەهیچ شێوەیەك ناهێڵێ باری بەلادا لار بێت و لایەنی بەرانبەر قسەی سوار بێ!

**حەوت:** خەڵك تۆمەتبار نەکردن و لەپشت پەردەی ڕەشەوە سەیرنەکردنیان ﴿ياءيها الذين آمنوا إذا ضربتم في سبيل الله فتبينوا ولاتقولوا لمن ألقى إليكم السلام لست مؤمنا

تبتغون عرض الحياة الدنيا فعند الله مغانم كثيرة، كذلك كنتم من قبل فمن الله عليكم..﴾ النساء (٩٤)، بەڵێ! مسوڵمان لەکافرکردنی خەڵکیو تاوانبار کردنیان لەبیانوو ناگەڕێو هەمیشە بۆیان لەبۆسەدا نیە کە بەلارێو خراپەکاریان دەربێنێ! چونکە خوای دادگەرو کاربەجێ هەڕەشەی توندی لەو جۆرە کەسانە کردووە کە ناوو ناتۆرەو شتی خراپ بەناهەق بەدوای خەڵکیدا بڵاودەکەنەوە ﴿والذين يؤذون المؤمنين والمؤمنات بغير ما اكتسبوا فقد احتملوا بهتانا وإثما مبينا﴾ الأحزاب (٥٨) وە ﴿إن الذين يحبون أن تشيع الفاحشة في الذين آمنوا لهم عذاب أليم في الدنيا والآخرة والله يعلم وأنتم لاتعلمون﴾ النور (١٩)، جادیارە کە تۆمەتبارکردنی خەڵکی بەکوفرو نیفاق و لارێبوون گەورەترین و بێزراوترین تۆمەتی ناڕەوایە کە بەناهەق بەنێو مسوڵمانان تەشەنە بکات و بڵاوبکرێتەوە.

ئێستاکەش کەمەتا ڕاددەیەک لەڕەوشتە بنچینەییەکانی هەڵس و کەوت لەگەڵ دەوروبەر حاڵی بووین، بابچینە سەر توێژینەوەی خاڵی دووەمی ئەم بەندە:

## ٢- پۆلاندن (تصنيف)ی کۆمەڵگای کوردەواری لەڕووی مسوڵمانەتییەوە:

ئاشکرایە کەگەلی کوردمان یەکێکە لەگەلە هەرە دێرینەکانی ئوممەتی ئیسلامی کەزۆر لەمێژە لەگەڵ ئیسلام دا ئاوێتەی یەکتر بوو ون، بۆیە مسوڵمانەتی گەلی کورد بەشێکی ڕوون و بێ چەندو چوون دادەندرێ، هەرچەندە دەشزانین کەچەند کەمە نەتەوەو ئاینێکی تێدا هەن، بەلام ئەندازەو ڕێژەیەکی وایان نیە کەحیسابێکی ئەوتۆیان لەسەر بکرێ[1].

---

[1] وەك دیانەکان و یەزیدییەکان و کاکەیییەکان و عەلەوییەکان.

بەڵێ! گەلی کورد -سوپاس بۆ خودا- بەگشتی موسوڵمانە، بەڵام لەڕووی ئەندازەی چاك تێگەیشتن لەئیسلام و پابەندبوو پەیڕەوی لێکردنیەوە دەتوانین بۆ سێ جۆر دابەشی بکەین، تاکو چۆنیەتی هەڵس و کەوتمان لەگەڵ ئەو خەڵك و کۆمەڵگایەدا ڕۆشنتر بێت:

یەکەم: ئیسلامی یەکان، جا چ لەچوارچێوەی ڕێکخراوێکی سیاسی دا بن، وەك برایانی یەکگرتووی ئیسلامی و برایانی ڕاپەڕینی ئیسلامی، یان هەر وەك شەخسی خۆیان بن، وەك ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی لەپیرو گەنج و خوێندەوارو نەخوێندەوار کە ئەوانیش وەك لایەنە ئیسلامی یە سیاسی یەکان بڕوایان وایەو مشووریش دەخۆن بۆ هێنانەوەو گێڕانەوەو بەجێکردنەوەی بەرنامەی خوا لەکۆمەڵگای کوردەواری‌دا.

دووەم: باقی خەڵکی موسوڵمان، کەوەك پێویست لەئیسلام تێنەگەیشتوون و پێیان وایە لەئیمان و عیبادەت و ئەخلاق بەولاوە نیەو، حوکم و سیاسەت هیچ پەیوەندی بەئایینەوە نیەو، ئایین -کەلێرەدا مەبەست ئیسلامە- پەیوەندیەکی ڕووحی و شەخسی ی نێوان خواو ئینسانەو هیچی تر، کەبەداخەوە زۆربەی هەرە زۆری موسوڵمانانی کورد لەم جۆرەن، ئەندازەیەکی زۆری ئەم جۆرە خەڵکەش لەشێوەی عەشایەرو خەڵکی کاسب و کارمەندی دائیرەکان و بازاڕی و کرێکارو جوتیارو تەنانەت زۆر لەڕۆشنبیرو خوێندەوارانیش هەن و، بەشێکیشیان لەنێو حیزبە سیاسی یە نائیسلامی یەکان دان.

سێ: ناموسوڵمانەکان، کەبڕوایان بەئیسلام نیەو سەرلەبەری یان بەشێکی بەهەڵەو ناتەواو دەزانن و ڕەخنەیان لێ ی هەیە، کەئەمانیش بەزۆری لەلایەنە سیاسی یە عەلمانی (لائیك)ەکاندا -بەتایبەتی لەئاستی سەرکردایەتی و کادیرەکانیان دا- خۆیان دەنوێنن، بەڵام هەر لەو جوغزو بازنانەدا کورت هەڵنەهاتوون و، کەم و زۆر بەنێو هەموو چین و توێژەکانی کوردەواری‌دا بڵاوبوونەتەوە.

جائێستا با بەکورتی و پوختی چۆنیەتی هەڵس و کەوتمان لەگەڵ هەرکام لەم سێ جۆرە خەڵکەی کۆمەڵگاکەمان دا ڕوون بکەینەوە:

## جۆری یەکەم : ئیسلامی‌یەکان

دیارە ئەمان وێرای مافەکانی برایەتی ئیسلامی کە بەحوکمی ﴿إنما المؤمنون إخوة﴾ پێویست دەبن و لەبەشی سی‌یەمی (چەند ڕێنموونی‌یەك بۆ حاڵەتی ئیسلامی لەکوردستاندا) ئاڕادەیەك باسمان کردوون، بەڵێ! وێرای جێبەجێ‌کردنی ئەو ئەرك و مافانە لەمەڵس و کەوت لەگەڵیان دا، پێویستە بەدەستبار پێکەوە گرتن و هاوکاری لەگەڵیان دا ئەرك و ئامانجی گەورەی کاری ئیسلامیشیان لەگەڵ ئەنجام بدری، کەبریتی‌یە لەگێڕانەوەی کۆمەڵگا بۆ باوەشی ئیسلام و بەرپاکردن (إقامە)ی ئایین وەك خوای مەزن فەرموویەتی ﴿شرع لکم من الدین ما وصی به نوحا والذي أوحینا إلیك وما وصینا به إبراهیم وموسی وعیسی أن أقیموا الدین ولا تتفرقوا فیه﴾ الشوری (١٣). چونکە بێگومان هێنانەوەی حوکمی ئیسلام و گێڕانەوەی خەڵك بۆ ژێر چەترو سێبەری بەرنامەی خوا کە بەختەوەری‌و بەمراد گەیشتنی دنیاو قیامەتیانی تێدایە، گەورەترین جۆری چاکەکاری‌و پارێزکاری (البر والتقوی)یە کەخوای میهرەبان فەرمانی پێ کردووین کە بۆ جێبەجێکردنیان هاوکاری یەکتر بکەین ﴿وتعاونوا علی البر والتقوی..﴾ المائدة (٢).

بەڵێ! بەڕاستی خەبات و تێکۆشان لەو ڕێیەدا گەورەترین جۆری (چاکەکاری)یە چونکە چاکە (إحسان)ی لەمە چاکترو گەورەتر لەگەڵ خەڵك دا بەخەیاڵ دا نایەت کە دەستیان بگری‌و بیانهێنی بۆ سەر سەرچاوەی هیدایەتی خوداو، بیانخەیتە ژێر سێبەری پڕ پیت و فەڕو دادگەرانەی حوکم و بەرنامەی خوا! وەدیارە ئەم ئەرك و کارە گرنگ و پیرۆزە چاکترین جۆری (پارێزکاری)یشە کەبەندە بەرانبەر بەخوای خۆی پێی هەڵدەستێ. جادەبێ چ (پارێزکاری)یەك لەوە چاکترو بەرزتر بێت کە ئینسانی موسڵمان هەر بەوەندە واز نەهێنێ کەخۆی ئەرکە فەرزو پەسند کراوەکانی خوا جێبەجێ بکات و، لە قەدەغە کراوو ناپەسندەکان دوور بکەوێتەوە، بەڵکو خەڵکیش بخاتە سەر ئەو ڕێیە! مەگەر ئەرکی بەرزو پیرۆزی پێغەمبەرانیش (صلی الله علیهم وسلم) هەر ئەوە نەبووە!!

ئنجا دیاره چۆنیەتی ئەو هاوکاریەو دەستبار بۆ یەکترگرتنەی نێوان بزووتنەوە ئیسلامیەکانیش پێویستی‌ی بەراوێژی وردو قووڵی هەموو لایەك و بەرنامەڕێژی لێزانانەو دووربینانە هەیە، کەلێرەدا دەرفەتی ڕوون کردنەوەی نیەو، سوپاس بۆ خوا کەم و زۆر کاری بۆ کراوەو هەنگاوی بۆ نراوە، بەڵام زۆری ماوە بگاتە ئاستی پێویست.

## جۆری دووەم : خەڵکی مسوڵمان بەگشتی

دیارە ئەمانیش بەحوکمی برایەتیمان لەگەڵیان لەسەرمان فەرزە کە ئەوەندەی بتوانین لەهەموو ڕوویەکەوە مافەکانیان جێبەجێ بکەین و برایەتی تەواوو پڕ بەپێستیان لەگەڵ ئەنجام بدەین، بەڵام بزانین کە گەورەترین مافیان لەسەرمان زیاتر شارەزا کردنیان و تێگەیاندنیانە لەئیسلام و بەرچاو ڕوون کردنەوەیانەو، ئەوەندەی لەدەستمان دا هەیە دەبێ هەوڵ بدەین ئایەتەکانی قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەریان بۆ ڕوون بکەینەوەو، ئەرکی فەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپەیان لەگەڵ دا جێبەجێ بکەین، بەڵام زۆر بەدانایی‌و وەستایی‌و شێنەیی‌و پلەپلەو لەگرنگتریەنەوە بۆ گرنگترو ئنجا بۆ گرنگ و... هتد، خوای زاناو میهرەبانیش فەرموویەتی ﴿ولتكن منكم امة يدعون إلى الخير ويأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر واولئك هم المفلحون﴾ آل عمران (١٠٤).

وە دڵنیاش بین لەوە کە هەرچەندە زمان پاراوو ڕەوانبێژ (فصيح وبليغ) بین و زیرەك و شارەزا بین هەتا ئیخلاص و تەقوای تەواوو کارامەیی‌و لێزانی‌و ڕەوشتی بەرزو پەسندمان نەبێ، نەك هەر ناتوانین ئامانج (هدف) وەدی بێنین، بگرە زۆریش نزیکە خەڵکیش لەئیسلام دوور بخەینەوەو برەنجێنین.

وە دەبێ لە هەڵس و کەوت لەگەڵ خەڵك وجەماوەری مسوڵمان زۆر وریای دوو مەسەلان بین:

یەك : لەپشت پەردەی ڕەشەوەو بەگومانەوە سەیریان نەکەین و لەکاتی دیتنی کەم و کووڕیەو هەڵەو ناتەواویەکانیاندا کاردانەوەی توندو بێ جێمان نەبێ‌و پێشمان

وانەبێ ئەو ان پڕ لەمەلەن و خۆشـمان بـەفری بێ‌پەلـەبین، وە وەك حەكیم و پزیشكێكی بەرەحم و بەسینگ فراوان لەگەڵ هەڵەو ناتەواویەو نەخۆشی‌یەكانیان دا مامەڵە بكەین.

دوو : لەگەڵ هەموویان دا بەیەك شێوە هەڵس و كەوت و ڕەفتار نەكەین و، لەگەڵ مەلادا وەك مەلاو مامۆستایەك و لەگەڵ شێخ دا وەك شێخێك و لەگەڵ گەنج و ڕۆشنبیرو شاریەو دێهاتی‌و... هتـدا هەركەسە لەئاستی خۆی داو وەك لێی دەوەشێتەوە ڕەفتار بكەین وەلەڕاستی‌دا حیكمەت و لێزانی ئەمەیە، هەربۆیەش خاتوو عائیشەی دایكی بڕواداران خودا لێی ڕازی بێ ڕۆژێكیان سوالكەرێك بەلایدا ڕەت بووئەویش پارچە نانێكی دایە، پاشان پیاوێكی بەلادا ڕەت بوو كەبەرگ و شێوەیەكی تایبەتی‌ی هەبوو، ئەویش دایبەشتاندو خواردنی دایە، جالەو بارەوە پرسیاری لێ كرا، ئەویش فەرمووی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (أنزلوا الناس منازلهم) واتە: خەڵكی لەپایەو پلەی خۆیان دا دابنێن و، لەگەڵ هەركەسە بەو شێوەیەی شایستەیەتی ڕەفتار بكەن[1].

## جۆری سێیەم : نامسوڵمانەكان

بۆ هەڵس و كەوت لەگەڵ ئەم جۆرە كەسانەدا پێویستە ئەم خاڵانە ڕەچاو بكرێن:

أ- ئەو ڕاستی‌یە بزانین كە ئەمانەش هەموویان یەك جۆر نین و جۆراو جۆرن و هەر جۆرەش حوكمی تایبەتی‌ی خۆی هەیە بۆ ڕەفتارو مامەڵە لەگەڵ كردن، بۆوێنە:

- هەیانە زۆر باش پەیام و بانگەوازی خوای پێ گەیوەو تێشی گەیشتووە، بەلام وەك فیرعەون كە خوا لەبارەیەوە دەفەرموێ ﴿وجحدوا بها واستيقنتها أنفسهم ظلما وعلوا﴾ النمل (١٤)، یان وەك ئەبوو جەهل كە زۆر باش دەیزانی (محمد)

[1] ئەم فەرموودەیە (أبو داود) گێراویەتەوەو (حاكم) بە (صحیح)ی داناوە، بڕوانە (ریاض الصالحین) لە١٦٨.

پێغەمبەری خوایە ﷺ، بەڵام لەبەر تێکەڵچوونی بەرژەوەندییە تایبەتی‌یە ناشەرعی‌یەکانیان ئامادە نەبوون مل بۆ حەق کەچ بکەن.

- بەڵام هەشیانە کەلەبەر نەزانی‌و بێ ئاگایی دژایەتی ئیسلام دەکات وەك گوتراوە (الناس أعداء ماجهلوا).
- هەشیانە کە لەبەر خۆبەزلگری‌و لووت بەرزی ئەسڵەن ئامادە نیە گوێ لەباتگ و پەیامی حەقی خوایی بگرێ، وەك خوای زانا فەرموویەتی ﴿فأعرض عن من تولى عن ذكرنا ولم يرد إلا الحياة الدنيا، ذلك مبلغهم من العلم..﴾ النجم (٢٩-٣٠).
- ئی واشیان هەیە ئیسلامی بەهەڵەو شێوێنراوی‌و هەڵبزرکاوی لەڕەفتاری کەسانێکی ناشی‌و ناشایستەدا کەوتۆتە بەرچاوو دەشزانێ کەوایە بەڵام هەر مەسەلەکە ئیهمال دەکات و گوێ‌ی پێ نادات و خۆی ماندوو ناکات.
- وەهەشیانە کە بەجیددی بەدوای هەق و تێگەیشتنی ئایین دا دەگەرێ بەڵام تائێستا نەگەیشتۆتە قەناعەت و دڵنیایی تەواوو لەحاڵەتی گومان و دوودڵی‌دا ماوەتەوە.
- ... هتد.

جا دیارە کە بۆ هەڵس و کەوت کردنی ڕاست و درووست و شەرعی‌یانە لەگەڵ هەرکام لەم جۆرە نامسوڵمانانە، شێوەیەکی تایبەتی‌و پربەپێست و گونجاو پێویستەو، نابێ لەگەڵ هەموویان دا وەك یەك ڕەفتار بکرێ، چونکە هەر کام لەم جۆرانە دەردو نەخۆشی‌یەکی تایبەتی‌ی لە نەخۆشی‌یەکانی کوفری تووش بووەو، دیارە پزیشکی شارەزاو داناش یەك جۆرە دەرمان و شێوەی چارسەر بۆ کۆمەڵە نەخۆشێکی خاوەن دەردی جیاجیا دانانێ!

ب- دەبێ تەواو تەواو دڵنیا بین کە ئەو کەسەی بەکافری لەقەڵەم دەدەین پەیام و بانگەوازی خوای بەڕاست و درووستی پێ‌گەیشتووە، بەڵام لەبەر دان پێدانەنێنان

(الجحود) یان خۆبەزلگری (الکبر) یان گوێ پێنەدان (الإعراض) یان هەر هۆیەکی تری بێجێ قبوولی نەکردووەو ملکەچی نەبووە، ئەگەرنا ئەگەر هیچی لێ حالی نەبوویێو نەزانێ ئیسلام چی‌یەو کەمتەرخەمیشی نەکردبێ، هەرچەندە مسولمانیش نەبێ بەلام بەکافریش لەقەلەم نادرێت، بەلکو حوکمی (أهل الفترة)ی هەیە، جا هەرچەندە ئەم جۆرە کەسانە کەمیش بن، بەلام لەنێو کۆمەلگای کوردەواریو غەیری کوردەواریش دا هەن و، دیارە حوکمیشیان جیایە لەوانی‌تر.

ج- پێویستە ئەو ڕاستی‌یە بزانین کە درووست بوونی حیزبە عەلمانی‌یەکان لە کوردستان دا لە باروودۆخێکی تایبەتی‌دا بووە، کە بریتی‌یە لە چەوسێنرانەوەو بێ‌کیانی گەلی کورد -کەتێستاشی لەگەڵ بێ هەر بەردەوامە- کەواتە دەبێ بزانین کە زۆربەی هەرە زۆری -ئەگەر هەموویشی نەبێ- ئەو خەلکە کەشوێن ئەو حیزبانە کەوتووە بۆ هێنانەدیی ئامانجێکی شەرعی‌و ڕەوا بووە کە لابردنی ستەم و زۆرو چەوساندنەوەی هەمە جۆرەیە، وە لەڕاستی‌دا خەلکی جگە لەسێبەری ئەو حیزبانە هیچ پەناو سێبەرێکی دیکەی شك نەبردووە، هەربۆیەش دەبینین دوای پەیدابوونی سێبەری ئیسلام و ئالای قورئان و، وردە وردەش شکست هێنانی فیکریو سیاسی‌و کۆمەلایەتی‌ی ئەو حیزبانە، خەلکی شوێنکەوتوویان کەم و زۆر دەست بەرداریان دەبن و دەگەڕێنەوە باوەشی ئیسلام، جاچ گەڕانەوەکە هەلوێستی کردەیی‌و سیاسی لەگەڵ بێ، چ لەگەلی نەبێ.

---



# بەشی سێیەم

# یازدە تێبینیو مەسەلەی گرنگ

**(١)**

نابێ حاڵەتی هەڵس و کەوت (تعامل) لەگەڵ حاڵەتی جەنگ و بەرەنگاری تێکەڵ بکەین و، هەرچی ئێمە لە بەشی دووەمی ئەم نامیلکەیەدا گوتوومانە دەربارەی حاڵەتی هەڵس و کەوتەوە، جائەگەر نەرمیو ئارامیو لێبووردن و چاکەکاریو بەزەییو پەرۆش و... هتد دەستوورو یاسای بازاڕی هەڵس و کەوت بن لەگەڵ خەڵکیدا بەکافرو موسوڵمانەوە، دیارە بازاڕی جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوە بەپێچەوانەوە، توندوتیژی (شدة)و دڵڕەقی (غلظة)و دەمارو بەرزی (عزة) یاساو دەستووریەتی!!

**(٢)**

ڕاگرتنی عیززەتی ئیسلام و هەیبەتی موسوڵمانان و پاراستنی ڕێزو حورمەت و کەرامەتیان، بەپابەندی بەشەرعەوە ملکەچی بۆ یاساو دەستوورەکانی دەبێ لەهەموو ئاستێك و لەهەموو بوارێکدا، نەك وەك هەندێ فەقیرحاڵی ناحاڵی گومان دەبەن، بەهۆی سەلام نەکردن و سەیارە لەسەبەرە ڕانەگرتن و ڕێز لەخەڵکی نەگرتن و تووڕەو تۆسنیو خۆ گرژو مۆن کردن و خۆ لەدیمەنی سەیرو نامۆدا پیشاندان و... هتد.

## (٣)

ئەگەر یەکێك بپرسی بۆچی باسی چۆنیەتی هەڵس و کەوتیشتان نەکرد لەگەڵ موونافیق و دەغەڵ و دووڕووەکان دا، کەبێگومان لەکۆمەڵگای کوردەواریەدا هەن؟! ئەوا لەوەلام دا دەڵێم:

هەرچەندە لەم قۆناغەی ئێستای کاری ئیسلامی لە کوردستان دا، ماویەتی کە خەڵکی کافرو ناحەز ناچارین لەبەرگی نیفاق و دەغەڵیدا خۆیان پەنهان بدەن، چونکە جاری ئیسلام نەبۆتە دەستەڵاتی سیاسیی وڵات، کەجێگای مترسیو سڵ لێ کردنەوەی ئەو جۆرە کەسانە بێ، بەڵام دەزانم کەم و زۆر موونافیق لەملاولا هەن، ئەمما بۆیە باسکردنیانم بەپێویست نەزانی بۆ شێوە هەڵس و کەوت لەگەڵیان دا، چونکە جاری نەبوونەتە دیاردە (ظاهرة)یەکی ئەوتۆ کە پێویستی بەچارەسەرێکی تایبەتی هەبێ، ئەگەرنا دەبێ زۆر بەوردیەو فراوانی توێژینەوەیان لەسەر بکرێ و پەردەیان لەسەر هەڵبماڵرێ.

## (٤)

ئەو شتانەی دەربارەی هەڵس و کەوت لەگەڵ کۆمەڵگای کوردەواریدا باسکران هەموویان، بۆ حاڵەتی ئاسایی‌و بێ کێشەو گرفتن، بەڵام لەکاتی ڕوودانی کێشەو گرفتێك دا، وەك دەستدرێژی کرانە سەر موسوڵمانێك، یان بەرچ و لەمپەر خستنە سەر ڕێی کاری ئیسلامی، ئەوە دیارە حاڵەتێکی تایبەت دێتە گۆڕێ وەك (حالة الطوارئ)و حوکم و هەڵوێستی تایبەتیشی بۆ پەیدا دەبێ، بەڵام ئەوەی کە زۆر گرنگ و گەورەیە ئەوەیە کە هەموو ئەندامانی وردو درشت و لایەنگران بزانن کە: بڕیاردان (قرار) بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن و ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو حاڵەتە تایبەتیەیە، تەنهاو تەنها بەدەست قیادەی باڵاو خاوەن ئەمرو نەهیەوە کەم و زۆر خەڵکیتر لەپێشمەرگەو ئەندام و کادیرو بەرپرس بۆیان نیە دەستی تێوەردەن، چ جای بڕیار بدەن و کاری خۆبەسەرانە ئەنجام بدەن! کە دوایی بەسەر هەموویان دا بەعقیادەو قاعیدەوە دەشکێتەوەو دەبێ باجەکەی

بەمن، ئنجا ئاشکرایە کەقیادەی بالاش بەبێ ڕاوێژو تاوتوێ کردن و پرس ورا وەرگرتنی هەموو ئەو کەسانەی کە شایستەیی ڕادەربڕینیان هەیە ئەو بڕیارە نادات، هەڵبەتە قاعیدەش مافی ڕادەربڕین و پێشنیارو تێبینی خستنەڕوویان هەیە بۆ قیادە، بەڵام دوای بڕیاردران و هەڵوێست وەرگیران هیچ کەس بۆی نیە بەهیچ شێوەیەك پرتەو بۆڵە بکات و ڕەخنە لەقیادە بگرێو تۆمەتی جۆراو جۆری بداتە پاڵ، چونکە ئەوە پیشەی مونافیق و دڵنەخۆشەکان بوو لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ دا.

وە لەڕاستیدا بزووتنەوەی ئیسلامی تائێستا باجی گەورە گەورەی ئەو جۆرە حاڵەتانەی داوە کە بەهۆی لاوازی قیادەو بزۆزیو سەرەڕۆیی چەند کەسێکی نێو قاعیدە لەلایەکەوەو پیلان و تەڵەکەی ناحەزان لەلایەکی دیکەوە پەیدا بوون!

(٥)

لەبواری هەڵس و کەوت لەگەڵ لایەنە سیاسیە لائیکەکان دا هەرچەندە پێشتریش هەندێك شت باسکرا، بەڵام بۆ زیاتر بەرچاو ڕوونی ئەم خاڵانەش دەخەینەڕوو:

**یەك :** وەك پێشتریش گوتمان لەڕووی بەرنامەو فیکریانەوە کەهیچ کامیان بڕوایان بە فەرمانڕەوایەتی (حاکمیە)ی ئایینی خودا نیە، بەیەك چاو سەیریان دەکەین، چونکە لەخوا بەزیادبێ لەوە وریاترین کە (باطل) بەهۆی جیاوازی ڕەنگ و ڕواڵەتەوە خۆیمان لێ بگۆڕێ!

**دوو :** بەڵام لەڕووی ڕەفتار لەگەڵ کردنیانەوە بەگشتی لەبەر تیشکی ئایەتی ﴿لاینهاکم الله عن الذین لم یقاتلوکم فی الدین ولم یخرجوکم من دیارکم أن تبروهم وتقسطوا إلیهم إن الله یحب المقسطین﴾ الممتحنة (٨)، هەر کەسێك ڕێگای دینداریمان لێ نەگرێو لەسەر ئەوە دژایەتیمان نەکات و ستەم و دەستدرێژی نەکات، هەوڵ دەدەین و بەبەشێك لەدینداریو خواپەرستیمانی دەزانین کە لەگەڵی چاکەکار بین، بەمەعنای فراوانی وشەی (چاکەکاریو دادگەری)، چونکە خوا خاوەنی ئەم سیفەتانەی خۆش دەوێ!

بەلاّم کێش هەڵوێست و ڕەفتاری چاکترمان و زیاتر ڕێزو حورمەتمان بگریتەوە هاوکارمان بکات و ئیمان بێتە پێش، ئێمەش بەپێی ئایەتی ﴿هل جزاء الإحسان إلا الإحسان﴾ و ئایەتی ﴿وإذا حييتم بتحية فحيوا بأحسن منها أو ردوها..﴾ بێگومان هەموو دەمەین پاداشتی چاکەی بەچاکترو ڕێزو حورمەت و هاوکاریشی بەباشتر بدەینەوە.

ئەوەش کە لەگەڵمان خراپ بێ یان ساردوسڕ بێ، لەسەر خۆمانی بەپێویست نازانین کە لەگەڵی چاك و گەرم و گوڕ بین، مەگەر بەرژەوەندی کاری ئیسلامی تێدا ببینین.

**سێ :** هاوشۆکردن و سەلام و چاکو چۆنی و پێشوازی لێکردن و... هتدیان لەسەر ئەو بنچینە ئەخلاقی‌یانەی پێشتر باسکران و لەسەر بناغەی پەیڕەوی لێکردنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ هەموو دەدەین لەسنووری شەرع دا هەمیشە خاوەن فەزڵ و چاکە بین و، لەوان باشترو گەرمترو بەخوڵق و خوونتر بین بەبێ زیادەڕۆیی، هەر کەسێکیش ئەمە بە (تنازل) بزانێ بەرەزمیمان بەعەقڵ و تێگەیشتنی‌دا دێنەوەو وادیارە لەقورئان و سوننەت بێ خەبەرە!!

**چوار :** بەڕوون و ڕاشکاوی بەلاّم حەکیمانەو بەشێوازو تەعبیری پاك و چاك و بەرز بانگەوازی خەڵك دەکەین بۆ لای خواو، لەڕاگەیاندنی ڕاستی‌یەکانی ئیسلام دا ڕوودەربایسی لەگەڵ هیچ کەس ناکەین، بەلاّم هەموو دەدەین هیچ وشەو تەعبیرێك بەکار نەهێنین کە ببێتە هۆی بریندارکردن و ڕووشاندنی هەست و نەستی لایەنە سیاسی‌یەکان، وەك قسەو تەعبیری سووك و جنێوو گاڵتە، چونکە خوای زاناو کاربەجێ فەرموویەتی ﴿ولاتسبوا الذين يدعون من دون الله فيسبوا الله عدوا بغير علم..﴾ الأنعام (١٠٨)، بەلاّم لەکاتێکدا ئەوان دەست پێشخەری بکەن و قسەو تەعبیری ناقۆڵاّو شێوازی نالەبار بەکار بێنن، ئێمەش بەمەعقی خۆمانی دەزانین کە لەقەدەر خۆیان ڕەفتار بکەین و بەرپەرچیان بدەینەوە، وەك خوای دادگەر لەسەر زمانی (نوح) عليه الصلاة والسلام بەرامبەر بەگەلەکەی فەرموویەتی ﴿إن تسخروا منا فإنا نسخر منكم كما تسخرون ...﴾ هود (٣٨)، بەلاّم بەهیچ شێوەیەك لەئاستی ئەدەبی بەرزی ئیسلامی نایەینە خوارو، هەر کاتێکیش زانیمان بەرژەوەندی بانگەوازو کاری ئیسلامی زیاتر بەوە دابین دەبێ و ئامانج

بەوە تەحقیق دەبێ دەبێ دان بەخۆماندا بگرین و بەربەرچیان نەدەینەوە، ؛ وادەکەین، وەك خوای میهرەبان فەرموویەتی ﴿وإذا خاطبهم الجاهلون قالوا سلاما﴾ الفرقان (٦٣) هەروەها خوای لێبووردە فەرموویەتی ﴿وجزاء سيئة سيئة مثلها فمن عفا وأصلح فأجره على الله﴾ الشورى (٤٠).

جادیارە ئەم هەڵبژاردنی بەربەرچ نەدانەوە کە (فضل)ە یان بەربەرچ دانەوە کە (عدل)ە، دەکەوێتە جوغزی کۆشش (إجتهاد)ی قیادەی باڵاو، کامیانی لەلا چاکتربوو دەیکاتە هەڵوێست، جیێ سەرنجیش ئەوەیە کەئێستانی مسوڵمان چ تاك چ کۆمەڵ لەبواری هەڵس و کەوتی لەگەڵ دەوروبەردا مادام پابەندی بەرنامەی خوا بێت، یان خاوەنی چاکە (فضل) دەبێ، یان دادگەری (عدل)!! هەربۆیەش خوای میهرەبان و دادگەر فەرموویەتی ﴿لاينهاكم الله عن الذين لم يقاتلوكم في الدين ولم يخرجوكم من دياركم أن تبروهم وتقسطوا إليهم﴾ الممتحنة (٨) کەدیارە (بر=فضل) و (عدل=قسط).

## (٦)

لەبواری یاسا شەرعییەکان (الأحكام الفقهية)و ئیجتیهاددا ڕامان وایە کە:

**یەك** : دەرگای کۆشش کردن و هەڵهێنجان (الإجتهاد والإستنباط) ئاوەڵایە بۆ هەر کەسێك کەتوانای بەسەردا بشکێ‌و مەرجەکانی تێدا هاتبنەدی، وەرای زۆریەی زاناو شەرعزانانمان پێ پەسندە کەدەڵێ ئیجتیهاد بەش دەکرێ (يتجزأ الإجتهاد) وە ئیجتیهاد سێ پلەی هەن:

أ- ئیجتیهاد لەجوغزی قورئان و سوننەت دا کەپێی دەگوترێ (الإجتهاد المطلق).

ب- ئیجتیهاد لەچوارچێوەی مەزهەبێکدا کەپێی دەگوترێ (الإجتهاد في المذهب).

ج- ئیجتیهاد لەسەر مەسەلەیەك یان چەند مەسەلەیەکدا.

کەواتە مەرج نیە کەسێك توانای بەسەر یەکەم دا نەشکێ، توانای بەسەر دووەم یان سێیەمیشدا نەشکێ.

**دوو :** هیچ کاتێك و لەهیچ ڕوونێکەوە بەرهەم و کەلەپووری زانایان، چ لەبواری عەقیدە چ ئەزکیە چ یاسا شەرعی‌یە کردەیی‌یەکان (الأحکام الفقهیة العملیة) بەدیلی قورئان و سوونەت نین، چونکە ئەو بەرهەم و کەلەپوورە هەرچۆن بێ تەنها جۆری حاڵی بوون و تێگەیشتنی زاناو پێشەوایانمانە ڕەحمەتی خوایان لێ‌بێ دەربارەی قورئان و سوونەت، دیارە ئەو تێگەیشتنەش لەیەکێکەوە بۆ یەکێکی دیکەو لەڕۆژگارو شوێنێکەوە بۆ ڕۆژگارو شوێنێکی‌تر دەگۆڕێو جیاواز دەبێ، یان لایەنی کەم دەگونجێ بگۆڕێو جیاواز بێ ئەگەر لەهەموو ڕوونێکیشەوە نەبێ لەڕووێکەوە، بەڵام قورئان و سوونەت وانین و بەکەڵکی هەموو کۆمەڵگایەك دێن و لەگەڵ هەموو کات و شوێنێك دا دەگونجێن.

بەڵێ! قورئان و سوونەت خودی (دین)ن، بەڵام بەرهەم و کەلەپووری زانایان کەلەڕێگای ئیجتیهادەوە پەیدا بووە تێگەیشتن (فهم)ە دەربارەی دین! کەدیارە (دین) یەك شتی نەگۆڕ (ثابت)ە، بەڵام جۆری تێگەیشتنی جۆراو جۆرەو دەگۆڕێ.

**سێ :** هەر مسوڵمانێکیش بۆ چۆنیەتی دینداری کردن و حاڵی‌بوونی لەقورئان و سوونەت لەبواری یاسا شەرعی‌یەکان دا سێ پلەی هەن:

أ- یان کۆشش کەر (مجتهد)ە، کەبەکەسەر خۆی لەقورئان و سوونەت یاساکان وەردەگرێو هەڵیان دەهێنجێ.

ب- یان شوێنکەوتوو (متبع)ە کەخۆی توانای هەڵهێنجانی نیە، بەڵام گەیشتۆتە ڕاددەیەك لەزانیاریدا کەبتوانێ سەنگ و سووکی‌و هەڵسەنگاندن بکات لەنێوان بیروڕاو بۆچوون و زانایانی کۆششکەر (مجتهد) داو، کامەی لەلا بەهێزتر بوو لەڕووی بەڵگەوە هەڵی بژێرێ، دیارە ئەم کارەش لەزاراوی شەرعزانانندا پێی دەگوترێ (الترجیح).

ج- یان لاساکەرەوە (مقلد)یە کەخەڵکی عەوام دەگرێتەوە هەرکەسێکە کە بەدوای زاناو پێشەوایەکی کۆششکەر دەکەوێ، بێ ئەوەی لەبەڵگەی بیروڕاو بۆچوونەکانی حاڵی بووبێ.

بەڵام پێویستە ئەوەش بگوترێ کەهەموو کەس ناتوانێ لافی ئەوە لێبدات کەلەپلەی (اتباع)[1] یش دایە چ جای (اجتهاد) ! بەڵکو دەبێ بەڕاستی گەیشتبێتە ئەو ئاستەو زانایان شایەدی بۆ بدەن، خوای زاناو کاربەجێش فەرموویەتی ﴿فاسألوا أهل الذكر إن كنتم لاتعلمون﴾ النحل (٤٣)، پێغەمبەری پێشەوایشﷺ دەربارەی کۆمەڵێك کە بەنەزانیو هەڵە فتوایەکیان بۆ هاوەڵێکیان دابوو پاشان لەئەنجامی ئەو فتوا هەڵەو نەزانانەیەدا کابرا مردبوو فەرمووی (قتلوه قتلهم الله ألا سألوا إذا لم يعلموا فإنما شفاء العي السؤال) رواه أبو داود.

جاخوا بەلوتفی خۆی بمانپارێزێ کەهەر ئەهلی ئیشتیها بین و خۆمان لێ نەبێتە ئەهلی ئیجتیهاد.

د- کەواتە هەر موسڵمانێك نەگەییبێتە پلەی کۆششکردن لەسەری فەرزە کەپابەندی زاناو پێشەوایەکی کۆششکەر (مجتهد) بێ، بەڵام لەسەر هیچ کەس فەرز نیە کە لەهەموو مەسەلەیەکدا لەوەو بیروبۆچوونی پێشەوایەکەی لانەدات، بەڵکو هەرکاتێك بۆی روون بۆوە کەحەق لەشوێنێکی ترەو پێشەوایەکەی لە فلان و فیسار مەسەلەدا نەی پێکاوە، لەسەری پێویستە شوێنی ئەو راوبۆچوونە بکەوێ کەلەقورئان و سوننەت نیزیکترە، چونکە پابەندی موتڵەق بەس بەقورئان و سوننەتەوە لەسەر هەموو کەس فەرزەو، زاناو پێشەوایانیشمان هەموو لەسەر ئەم راستی‌یە یەکدەنگ (متفق)ن.

وەلەڕاستی‌دا دەمارگیری (تعصب)ی بێ‌بەڵگەو سووربوون لەسەر دواکەوتنی بیروڕایەکی هەڵە عادەتی بت پەرستەکانی سەردەمی نەفامی بوو، وەك قورئان لەچەندان جێگادا باسی کردووەو لەسەر ئەوە لۆمەو سەرزەنشتی کردوون، دیارە زۆربەی بەهەڵەداچوونی خەڵکیش لەم بارەوە دەگەڕێتەوە بۆ زیادەڕۆیی‌و بەزایەدان (الإفراط

---

[1] دیارە وشەی (اتباع) بەمەعنای قورئان و سوننەتی جیایە لەمەعنا زاراوەیی (اصطلاح)یەکەی، چونکە بەمەعنای قورئان و سوننەتی هەموو موسڵمانان دەگرێتەوە بێ جیاوازی.

والتفريط)، هەربۆیەش خوای پەروەردگارمان تبارك وتعالى لەڕووی مەدحەوە بەئیمەی ئوممەت و شوێنکەوتووانی پێغەمبەری کۆتاییﷺ ی فەرمووە ﴿وكذلك جعلناكم امة وسطا﴾ البقرة (١٤٣).

## (٧)

## لەبواری ئەخلاق و تەزکیەی نەفس دا :

هەرچەندە لەخوای بەرزیاد بێت هەم لەکتێبی (ڕێگای صالح بوون و بەرەو خواچوون)داو هەم لەبەشی سێیەمی کتێبی موسوڵمانی کامل (خوو و ڕەوشتی موسوڵمان)دا تارادەیەکی باش مەسەلەی تەزکیەی نەفس و ئەخلاقمان تواژیتەوە، بەلام لێرەش هەر بەکورتی دەڵێین:

**یەك :** تەزکیە کە بەمەعنای گەشەکردن و پاك بوونەوە دێ یەکێکە لەچوار ئەرکە گەورەو گرنگەکانی پێغەمبەرﷺ کەلەچوار شوێنی قورئانی پیرۆزدا[1]باسکراون.

وەلەڕاستیدا خوشك و برا موسوڵمانە خۆشەویستەکانم! ئینسان بەبێ تەزکیەی نەفس تامی ئیسلام ناچێژێت و ئیمانەکەی قوول و دامەزراو نابێ‌و، لەزۆرێك لەعیبادەت ناکات و، لەئاقار قەدەغەکراوو ناپەسندەکان دا خۆی پێ مەرزەم ناکرێ‌و، بۆ جێبەجێکردنی ئەرکە پێویست و پەسندکراوەکان چالاك و گورج و گۆڵ نابێ‌و لەخوو و خدە پیسە ئاژەڵی‌و درندەیی‌و ئیبلیسیەکان پاك نابێتەوەو بەخەسڵەتە بەرزو جوانەکان نارازێتەوە، هەربۆیەش هەندێك لەزانایانی تەزکیەو عیرفان، تەزکیەی نەفسیان بەپایەی ئیحسان (مقام الإحسان) لەقەڵەم داوە.

---

[1] بڕوانە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (١٢٩) و (١٥١) ؛ سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (١٦٤) ؛ سوورەتی (الجمعة) ئایەتی (٢).

**دوو :** زاراوەی (تصوف)یش کـەمتر پـەیدابوو وەك بـاقی زاراوەکـان وەك (فقـه)و (کلام)و (أصول الفقه)... هتد، وەکرا بەناوونیشان بۆ زانیاری تەزکیەو ئـەخلاق و پایـەی ئیحسـان، نابێ لەبەر بۆ خراپە بەکارهێنران (سوء الأستفادة)و شێوێنرانیو ئەفسانەو شیرك و بیدعەت تێخزێنرانی لەبەر چاومـان بکـەوێتو، هـەموو ئـەو ئەزموونگـەل و بەرهـەم و کەلەپووری زاناو پێشەوایانی مەیدانی تەزکیەو سلووك فـرێ بدەیـن، چونکـە بەرهـەم و کەلەپووری زانایان لەهیچ بوارێك دا تەفانەت تەفسـیرو شـەرحی (حدیث)یش لەهەڵـەو ناتەواوی خـاڵی نیـە، دیـارە هـەر ئەمەشـە جیـاوازی نێـوان (وەحـی)ی خـواو (فیکـر)ی ئینسـان، کەیەکەمیان هەقی موتڵەق و بـێ هەڵـەو پەڵـەی پێیـە ﴿وبالحق انزلناه وبالحق نزل..﴾ الإسراء (١٠٥) ، بەڵام دووەمیـان هـەم ڕاسـت و هـەم هەڵەشـی لێ دەوەشـێتەوە، هەربۆیـەش هـەتا زیـاتر دەسـت گرتـوو (معتصم) بـێ بەوەحی‌یـەوە لەهەڵـەو خلیسـکان پارێزراوتر دەبێ.

بەڵێ! نابێ هیچ کاتێك دەست بەرداری هەق بین لەسـۆنگەی ئـەوەوە کـە (باطل)ی لەگەڵ تێکەڵ بووە، بەڵکو پێویسـتە بەبێژینگی قورئان و سـوننەت پاشـان عـەقڵ و پـاك و پیس و، ئازاو ترپۆکی ئـان لێك هەڵاوێرین، وەك خـوای دادگـەرو کاربـەجێ ڕێنمـایی کردووین ﴿الذین یستمعون القول فیتبعون أحسنه أولئك الذین هدی الله وأولئك هم أولـوا الألباب﴾ الزمر (١٨).

**سێ :** پێویسـتە ئەو ڕاستی‌یەش بزانرێ کەمەسـەلەی تەزکیەی نەفس کـەخوای زانـا بەختەوەریو سەرفرازی موتڵـەقی پێوە بەسـتووە ﴿ونفس وما سواها، فألهمها فجورها وتقواها، قد أفلح من زکاها، وقد خاب من دساها﴾ الشـمس (٧-١٠) بـەبێ هـەبوونی سەرمەشق و چاوساغێك مەگەر بەدەگمەن ئەگەرنا دەستگیر نـابێو بـۆ ئینسـان میسـەر نابێ، کەواتە با وانەزانین بەکتێب خوێندنەوە موتالاّی ڕووت دەتوانـین ببینـە مەلـەوانی دەریـای بـێ سـنووری عیرفـان و خـاوەنی نەفسـێکی ئـارامگرتوو ﴿النفس المطمئنة﴾ و لەهەردووك قۆناغی سەرەتایی ﴿أمارة بالسـوء﴾ و نێوەنجـی ﴿اللوامة﴾ هەڵبەڕین و دەبێت ﴿راضیة مرضیة﴾ ! دیارە ئەمـەش وەك حاڵـەتی گشـتی ئەگـەر شـتی دەگمـەن (شاذ) و هەڵاوێرراو (مستثنی) هەر هەیە.

**چوار:** چاكترين سەرچاوەكانى (تصوف)يش -كەمن زاراوى (تزكية) بەباشتر دەزانم كەلەبرى بەكار بێت، شەرو دەعواش لەگەڵ وشەى (تصوف) بەڕەوا نازانم- بەبڕواو بەپێى ئەزموون و شارەزايى ئێمە ئەمانەن:

أ- (إحياء علوم الدين)ى (غەزالى)، بەلام دەبێ وريابين هەرچەندە دەريايەكى پڕگەوهەرو مرواريیە بەلام دێوو دڕنج و قەوزەو ليتەولاڵى؛ فەرموودەى ناڕاست و بيروبۆچوونى ديانەكان و هينلۆكىيەكان و تەنانەت فەيلەسوفەكانى يۆنانيشى تێدايە[1]!

ب- (الحكم العطائية) ى (عطاء الله الأكندري) كە هەر شەرحى (إيقاظ الهمم في شرح الحكم)و هەم شەرحێكى (سعيد حوى)شى لەسەر كراوە، بەناوى (مذكرات في منازل الصديقين والربانيين).

ج- (الفتح الرباني)ى (عبدالقادر)ى گەيلانى.

د- (مكتوبات)ى (الإمام الرباني).

هـ- (مدارج السالكين)ى (إبن القيم الجوزية).

ئنجا شايانى باسە (إبن تيمية)ش لەدوو بەرگى (١٠ و ١١)ى (مجموع الفتاوى)يەكەيدا بەناوى (السلوك) و (التصوف) شتى جوان و بەنخيمەتى فەرمووە.

بەلام ئەمان سەد ئەمان نەچى توخنى كتێبەكانى (محي الدين بن عربي الطائي)[2] بكەوى وەك (فصوص الحكم) و (الفتوحات المكية) كەشتى وايان تێدايە بەسەد تەئويل و

---

[1] بەلام سوپاس بۆخوا (إبن قدامة المقدسي) كتێبى ناوبراوى پوختە كردۆتەوەو لەبێژينگى داوە بەناوى (مختصر منهاج القاصدين) كە (علي حسن علي عبدالحميد) فەرموودەكانيشى تەخريج كردوون.

[2] ديارە هەركام لە (إبن الفارض) و (أبن سبعين) و (حلاج) و (صدرالدين القونوي)يش هەر لەو جۆرەن و لەيەك سەرچاوەوە خواردوويانەتەوە، قسەش لەبارەيانەوە زۆرن بەلام لێرەدا دەرفەت نيەو، سوپاس بۆ خوا لەمێژيشە كەس بەرپەيان نابێوى.

پێنەو پەرۆش لەگەڵ قورئان و سوننەت رێك ناكەون و، هەر خـوا بەسـەرئەنجامی ئاگـاداره بەڵام ئەو كتێبانەی پڕن لەكوفرو بێ‌بڕوایی‌و زەندەقە!

شایانی باسە كە (رسائل النور)ی مامۆستا سەعیدی نۆرسیش باس و بابەتی یـەكجار شیرین و یەكجار دڵگیریان تێدان لەبواری خواپەرستی‌و ئـەخلاق و تەزكیـەی نـەفس دا، رەزاو رەحمەت و بەرەكەتی خوا بەرزێ بەسەر هەموو ئەم زاناو پێشەوایانەو سەرجەم زانـاو پێشەوایانماندا‌و لەجیاتی ئێمەو باقی مـوسڵمانان پاداشتی هەرە بەرزو پەسندیان بداتەوە.

(٨)

## لەبواری ئیمان و كوفریش دا روونكردنەوەی ئەم راستی‌یەش بەگرنگ و پێویست دەزانم :

هەروەك چۆن (خـوارج) لـە بـەكافردانان (تكفیـر)ی گوناهبـاراندا دووچـاری هەڵـەو تێپـەڕاندن (إفراط) بـوو بـوون و ئێســتاش هـەندێك كـەس كـەم و زۆر كەوتوونەتـە ژێـر كاریگەری‌ی بیروبۆچوونە توندە ناشەرعی‌یەكانیان، كۆمەڵێكی تریش لەبەرانبـەر ئەوان دا وەپێچەوانـەی ئەوانـەوەو لەكاردانـەوەی وانـەوە گـیرۆدەی كـورت هێنـان و بەزایـەدان (تفریط) بوو بوون كە (مرجئة)كانن و ئێستاش خەڵكی ئیمـان سـست و عـەزم شـل وپـل هەن، كەكەم و زۆر لەژێر ركێفی بیروبۆچوون و هەڵوێستی خوارو خێچی ئەوان دان!

بەڵێ! لەكاردانەوە (ردفعل)ی (خـوارج) كەلەئەسـڵ دا لـەدژی عـەلی كـوڕی ئـەبوو تالیب -خودا لێی رازی بێ- پەیدا بوون و خـۆیەو كۆمەڵـەكیان بـەكافر دانـاو، پاشـان هـەموو خـاوەن گونـاهێكی گـەورەیان بـەكافر دادەنـا، مورجیئـە[1]كـان پـەیدا بـوون كـە

---

[1] ئەم تاقمە بۆیـە نـاونراون (مرجئة) چونكـە كـردەوە (عمـل)یـان لـەئیمان دوا دەخسـت و دەیانگوت كردەوەی چاك (العمل الصالح) بەشێكی تەواوكـەری ئیمـان نیـە، وشـەی ⇐

بەپێچەوانەوە دەیانگوت هیچ گوناح و تاوانبارێك هەرچەندە زۆریش زیان بەئیمان ناگەیەنن و، ئیمانی پارێزکارترین کەسیش لەگەڵ ئی خراپەکارترین کەس دا هەروەك یەکەو فەرقیان نیە، چونکە ئیمان بەرزیو نزمیو کەمیو زیادەی نیە!

دیارە جەماوەری موسوڵمانیش کەلەسەر خەت و ڕێبازی پێغەمبەرو هاوەڵە بەڕێزەکانیو بە (أهل السنة والجماعة) ناسراون لەبەرانبەر (أهل البدعة والفرقة)دا کەشۆرەت و نازناوی لادەرو یاخیو سەرلێشێواوەکان بوو، هەم ڕای توندو تیژی (خوارج)و هەم هەڵوێست نەرم و شلی (مورجئة)کانیان بەهەڵە زانیوەو، فەرموویانە: خاوەنی گوناح و سەرپێچی بەعەینی گوناح و خراپەکەی -مادام نەگەیشتە ڕادەی کوفری گەورەو شیرکی گەورەو نیفاقی گەورەو ئەو خراپەو تاوانەش بەحەڵاڵ نەزانێ- کافر نابێ، بەڵکو هەر لەبازنەی ئیسلامدا ماوە، هەرچەندە گوناحبارەو لاشیداوە، بەڵام بەم شێوەیەش نیە کە (مرجئة)کان دەڵێن و، پارێزکارو تاوانبارن وەك یەك نین، وەك خوای دادگەرو کاربەجێ فەرموویەتی ﴿أم نجعل الذين آمنوا وعملوا الصالحات كالمفسدين في الأرض! أم نجعل المتقين كالفجار؟!﴾ ص (٢٨).

لێرەدا پێویستە ئەوەش بگوترێ کە تێکرای ئەو بیروبۆچوون و هەڵوێستە داهێنراو (بدع)انەی کە بەدرێژایی مێژووی ئیسلام و موسوڵمانان پەیدا بوون و، ئێستاش و لەمەودواش دادەهێنرێن و پەیدا دەکرێن لەشێوەی کارو کاردانەوە (فعل و رد الفعل)دا پەیدا دەبن، بۆ وێنە:

لەکاردانەوەی هەڵەو لادانی بێئام و هەڵوێستی کەللەرەقانەو بێویژدانانەی (خوارج) لەبەرانبەر عەلی کوڕی ئەبی طالب دا -خودا لێی ڕازی بێ- کۆمەڵێك پەیدابوون بەناوی (شیعە) کە دواتر نازناوی (رافضة)شیان وەرگرت، کەئەگەر (خوارج) عەلی (رضي الله عنه)یان بەکافرو دوژمنی خوا دادەنا! (شیعە) لەبەرانبەردا بەدۆست (ولي)ی خوایان دانا کە بێگومان هەروا بوو، بگرە لەڕۆژگاری خەلافەتی خۆیدا

---

(أرجا)ش واتە (أخر) دوای خست، وەك خوای گەورە فەرموویەتی ﴿وآخرون مرجون لأمر الله..﴾ التوبة (١٠٦)، واتە: حوکم دەربارەیان نەدراوەو جارێ دواخراوە.

گەورەترین و چاکترین هاوەڵی پێغەمبەرﷺ و بەندەی خوا بوو، پاشان (شیعە) دوای ئەوەی لەسەردەمی (موعاویە)و دەستەڵاتدارانی دیکەی (بني أمية)دا لەسەر مینبەرەکان قسەی ناشیرین بە (عەلی) گوتراو بەناهەق هێرشی کرایە سەر، ئەوانیش لەکاردانەوەدا زیاتر بەمەدح و ستایشی‌دا چوونە خوار، هەتا وایان لێکرد کە لەهەموو هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ گەورەترە، نەك هەر ئەوە بەڵکو خەلیفەی بەهەقی پێغەمبەرﷺ خوا لێیان ڕازی بێ ستەمیان لێ‌کردووە، بەتایبەت (ئەبوو بەکر) و (عومەر) خوا لێیان ڕازی بێ‌وا!! پاشان ئەو ڕۆچوون و زیادەڕۆیی‌یە هەر پەرەی‌ستاند هەتا سەرەنجام (عەلی) خوای لێ ڕازی بێ لەزۆربەی پێغەمبەرانیش علیهم الصلاة والسلام بەرزتر کرایەوە، هەندێکیشیان کردیان بە خوا، کە دواتر بە (علي الله) یان (علوي) ناسران!!

ئنجا لەکاردانەوەی ئەو (غلو)و تێپەڕاندنەی (شیعە)شدا[1]، خەڵکێکی دیکەی نەفام پەیدابوون کەدژایەتی (عەلی) و (أهل البيت)یان کردە پیشە کەپێیان دەگوترا (الناصبة) ڕاست بەپێچەوانەی (رافضة)!

بەڵام سوپاس بۆ خوا جەماوەری موسڵمانانی پابەند بە قورئان و سوننەت و ڕێبازی هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ بەگشتی‌و، چوار جێ‌نشینە سەر ڕاستەکان (الخلفاء الراشدون) بەتایبەت، لەبەرەکەتی پابەندبوونیان بە قورئان و سوننەت و ڕۆیشتن لەسەر ڕێبازی هاوەڵان (الأصحاب) خوا لێیان ڕازی بێ، گیرۆدەی ئەو جۆرە هەڵانە نەبوون و، هەم حورمەت و ڕێزی هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ و، هەم خانەدان و خزمانی بەڕێزی پێغەمبەریشیان پاراستووە دووچاری دوو دەردی پیسی (رفض) و (نصب) نەبوون.

---

(1) شایانی باسە کە هەندێك لەشیعە نەگەیشتە ئەو ڕادەیەو لەئاستێکی نزمتردا مانەوە بەتایبەت زەیدیەکان.

لەقورئانی بەرێزدا زۆر جار داکۆکی لەسەر ئەوە کراوە کە دەرس و پەند لە بەسەرهات و سەرگوزشتەی ڕابردووان وەربگرین و ئەم جۆرە تەعبیرانە لە قورئان دا زۆرن:

- ﴿إن في ذلك لعبرة لأولي الأبصار﴾ آل عمران (١٣).
- ﴿ ..ثم انظر كيف كان عاقبة المكذبين﴾ الأنعام (١١).
- ﴿ ..لقد كان في قصصهم عبرة لأولي الألباب..﴾ يوسف (١١١).
- ﴿قد خلت من قبلكم سنن فسيروا في الأرض فانظروا كيف كان عاقبة المكذبين. هذا بيان للناس وهدى وموعظة للمتقين﴾ آل عمران (١٣٧-١٣٨) .

کەواتە باتیمەش گوێڕایەڵ و فەرمانبەری قورئان بین و لەمێژووی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام و گەلەکانیان بەگشتی و، مێژووی پێغەمبەری خۆمان ﷺ و ئوممەتەکەی بەتایبەت ورد بینەوە دەرس و پەند وەربگرین، جا ئەوەی لێرەدا دەمەوێ باسی بکەم بۆ پەند لێ وەرگرتن مەسەلەی دیاردەی (خوارج)ەکانە کە لەرۆژگاری خەلافەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دا خوا لێی ڕازی بێ سەری هەڵداو بوو بەمایەی کێشەو گرفتی زۆر بۆ خەلیفەی چوارەم بەتایبەت و ئیسلام و موسڵمانان بەگشتی!

چونکە وەك هەستم پاگرتووەو سەرنجم داوە کەسانێك هەن لەنێو حاڵەتی ئیسلامی‌دا بەگشتی (لە کوردستان و غەیری ئەوێشدا) کەهەندێك یان زۆر لەخەسڵەتە دزێوو ناشەرعی‌یەکانی ئەو تاقمە سەرگەردانەیان تێدان، لەگرتنی هەندێك لایەنی ئیسلام و فەرامۆش کردنی لایەنەکانی دیکەیەو، قورئان خوێندن و لەبەرکردنی بەبێ تێگەیشتن و هەزم کردنی‌و، بێ‌ئاگایی لە سوننەت و سیرەو ژیانی پێغەمبەر ﷺ و، زۆر ڕۆچوون و (غلو)ی بێ‌جێ لەهەندێك شت داو، گەورەکردنی شتی بچووك و ئیهمال کردنی شتی گەورەو بنچینەیی‌و، دڵرەقی‌و بێ ڕەحمی بەرانبەر بە موسڵمانان و کافرکردنیان بەناهەق و بەبێ بەڵگەی شەرعی‌و، زۆر ڕا لەخۆبوون و سەرسام بوون بەزانیاری و شارەزایی خۆو، ڕەواج پێدانی هەندێك دیاردەو دەمەن بەناوی ئیسلامەوە کردنیان بەسەنگی

مەحەکی دینداریو پارێزکاری! وەك دەلینگ هەڵپێچان و داکۆکی کردن لەسەر هەندێك سوننەت و ئاداب وەك ئەوەی ڕوکن و پایەی ئیسلامەتی بن!

دەفەرموو باپێکەوە سەرنجی چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ بدەین کە وەصف و پێناسەی ئەو دەستە سەرلێشێواوە دەکەن کە نەك هەر خۆیان پێ لە (علي بن أبي طالب) رضي الله عنه مسوڵمانتر بوو، بگرە خۆیشی‌و هەموو ئەوانەش کە لەگەڵی بوون بەکافریان دەزانین! پاشان سەرنجی واقیعی خۆشمان بدەین داخوا ئێوەش -خوشك و برا دڵسۆزەکانی ئیسلام- پشتگیریم ناکەن لەڕاستیی بۆچوونەکەم دا، سەبارەت بەو نیمچە (خوارج)انەی ئەم ڕۆژگارە؟!

أ- عن علي بن أبي طالب رضي الله عنه قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: (سيخرج قوم في آخر الزمان أحداث الأسنان، سفهاء الأحلام، يقولون من قول خير البرية، لايجاوز إيمانهم حناجرهم، يمرقون من الدين كما يمرق السهم من الرمية..) متفق عليه.

ب- عن أبي سعيد قال: بعث علي بن أبي طالب إلى النبي، من اليمن بذُهَيْبَة في أدم مقروض لم تحصل من ترابها، فقال: فقسمها بين أربعة نفر، فقال رجل من أصحابه: كنا أحق بهذا من هؤلاء! قال: فبلغ ذلك النبي ﷺ فقال: (ألا تأمنوني وأنا أمين من في السماء يأتيني خبر السماء صباحا ومساء؟!) قال: فقام رجل غائر العينين، مشرف الوجنتين، ناشز الجبهة، كث اللحية، محلوق الرأس، فشمر الأزرار! فقال: يارسول الله! إتق الله، فقال: ويلك! أولست أحق أهل الأرض أن يتقي الله؟!) قال: ثم ولى الرجل، فقال خالد بن اوليد: يارسول الله! ألا أضرب عنقه؟! فقال: (لا، لعله أن يكون يصلي) قال خالد: وكم من مصل يقول بلسانه ماليس في قلبه، فقال رسول الله: (إني لم أؤمر أن أنقب عن قلوب الناس، ولا أشق بطونهم) قال: ثم نظر إليه وهو مقف فقال: (انه يخرج من ضئضئي هذا قوم يتلون كتاب الله رطبا لايجاوز حناجرهم، يمرقون من الدين كما يمرق السهم من الرمية، قال: أظنه قال: لئن أدركتهم لأقتلنهم قتل عاد) متفق عليه وهذا اللفظ لمسلم[1].

---

[1] بڕوانە (مجموع فتاوى شيخ الأسلام ابن تيمية) ب٧، ل٤٧٧٩-٤٨٠.

ج- (.. يحقر أحدكم صلاته مع صلاتهم، وصيامه مع صيامهم، وقرآءته مع قراءتهم، يقرؤن القرآن لايجاوز حناجرهم..)[1].

جا ئێستا با لەچەند خاڵێكی كورت دا لەبەر تیشكی ئەم سێ فەرموودەیەدا سیماو سیفەتە زەقەكانی ئەو تاقمە لارێیە بخەینەروو، تاكو ئەوانەی لەم ڕۆژگارەش دا كەم و زۆر ڕەچەڵەكیان دەچێتەوە سەروان بیان ناسین، چونكە بۆشمان ڕاست نەكرێنەوە ئەوا بەلایەنی كەمەوە لەشەڕو زیانیان پارێزراو دەبین:

١- دەرچوون لەرێبازی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی رضي الله عنهم (سیخرج..) ، دیارە ئەمەش بەهۆی تێنەگەیشتنیانە لەقورئان و دووریان لە سوننەتەوە.

٢- كەم تەمەنی (أحداث الأسنان) ، كەدیارە ئەمیش دەبێتە هۆی كەم ئەزموونی و قووڵ نەبوونەوە لە ئیسلام دا.

٣- كەم عەقڵی و نەفامی (سفهاء الأحلام) ، كەواتە دیارە خەڵكێكی سادەو فامكاڵ و فەقیر حاڵ زیاتر دووچاری ئەم دیاردەیە دەبن.

٤- فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ لەبەركردن و خوێندنەوەی بێ تێگەیشتن (یقولون من قول خیر البریة) ، سەرنج بدە چۆن پێغەمبەر ﷺ (قول)ی ڕووتی فەرمووە!!

٥- ئیمانێكی دەمیی و ڕواڵەتیی و لە گەروو ئەودیو نەبوو (لایجاوز إیمانهم حناجرهم).

٦- سەرەنجام لەئایین دەرچوون وەك دەرچوونی تیر لە كەوان (یمرقون من الدین..) ، چونكە وەك زانایان فەرموویانە (البدع دهلیز الكفر) واتە: بیدعەتەكان دەروازەی چوونە نێو كوفرن.

٧- هەواو ئارەزووی خۆزالكردن بەسەر شەرع دا (كنا أحق بهذا..) ، دیارە هەروەك چۆن چاكە چاكە بەدوای خۆیدا دێنێ، خراپەش خراپە پەلكێش دەكات!

---

[1] بروانە هەمان سەرچاوەی پێشوو، ب٧، ل٣٢-٣٣.

٨، ٩، ١٠- چاو قووڵ بوون و ڕوومەت بەرز بوونەوەو نێوچەوان هەڵتۆقین (غائر العینین، مشرف الوجنتین، ناشز الجبهة) ، ئەمانە یان هەر چەند سیفەتێکی بیچمیی ئەو شەخسە بوون، یان ئەنجامی زیادەڕۆیی کردن لەهەندێك جۆرە عیبادەت دا وەك نوێژو ڕۆژوو گرتن، ئەو نیشانانەی تێدا پەیدابوون.

١١، ١٢، ١٣- ڕیش چڕو پڕو سەرتاشراوو دامێن هەڵپێچراو (كث اللحیة، محلوق الرأس، مشمر الأزار)[1]، ئەم سێ دیاردەیەش زۆر خۆ بەڕواڵەت و شتی گچكەو جوزئییەوە خەریك كردنن لەسەر حیسابی نێوەرۆك و شتی پێویست و گرنگ!

١٤- زۆر خۆ بەپاك و چاك زانین و ئیددیعای زل زل (یارسول الله اتق الله!) ، چونكە كابرا كە ئیسلامی هەر لەو چەند شتە ڕواڵەتیو جوزئییەدا بینیی‌و، وایزانی بەس ئەوەندەیە، بە ئەنجام دانی ئەو شتانە خۆی‌ی لێ بایی دەبێ، چونكە لەلایەكەوە ڕاستییەكان (حقائق)ی ئایین تێكەڵ بە دڵ و دەروونی نەبوون، تاكو تام و چێژێك بكات و بزانێ چ باسە! لەلایەكی دیكەشەوە پێ‌ی وایە كە ئەو بەئەنجامدانی ئەو چەند شتە گەیشتۆتە ئەوپەڕی پلەی دینداریو شتێكی دیكە نەماوە ئەنجامی بدات!!

١٥- قورئان زۆر خوێندن و زمان پێ پاراو بوون بەڵام تام و چێژی تێگەیشتنی لەدەروازەی گەروویان بەرەو خوار نەترازێ (یتلون كتاب الله رطبا لایجاوز حناجرهم)، بەڵێ! ئیمانی سەركێڵ و ڕووكەش و قورئان خوێندنی سەرزارەكی!

١٦، ١٧، ١٨- نوێژكردنی زۆرو ڕۆژوو گرتنی زۆرو زۆر قورئان خوێندن (یحقر أحدكم صلاته مع صلاتهم، وصیامه مع صیامهم، وقراءته مع قراءتهم) ، چونكە هەركەسێك

---

[1] شایانی باسە كە (ازار) و (ثوب) و (رداء) پۆشاكی عارەبین و لە شەرواڵی كوردی جیان، بۆیە ئەو داوێن كورت كردنەوەی كە لەواندا فەرمانی پێ كراوەو بەلای كەمەوە بە سوننەت دانراوە، بەرگ و پۆشاكی كوردی ناگرێتەوەو، پێویست ناكات برایانی موسڵمانی كورد بەنیازی سوننەت جێبەجێ‌كردن یان خۆ لەحەرام پاراستن دەلینگی شەرواڵەكانیان كورت بكەنەوە یان ئەگەر درێژ دووراوبوو هەڵی پێچن.

دینداری‌ی بەرواڵەت و بێ رووح وەرگرت، زیاتر گرنگی بە قەبارەو چەندێتی (الكمیة) دەدات، لەجیاتی نێوەرۆك و چۆنیەتی (الكیفیة) ؛ بێ‌خەبەر لەوەی کە خوای کاربەجێ فەرموویەتی ﴿لیبلوكم أیكم أحسن عملا..﴾ الملك (٢) واتە کردەوەی چاکتر، نەك زیاتر[1]!! کەدیارە چاکبوونی کردەوەش بەهەردووك مەرجی (الإخلاص) و (الاتباع) دەبێ.

بەڵێ! ئەم هەژدە (١٨) خەسڵەت و نیشانەیە درووشمی (خوارج)ن، خوا هەموو لایەکمان چەپاڵە بدات لەمانەو لەهەموو سیفەتێکی بەدو شووم.

بەڵام لێرەدا بەپێویستی دەزانم دوو تێبینی بخەمەڕوو:

**یەك:** مەرج نیە هەر کەسێك چەند خەسڵەتێکی (خوارج)ی تێدابوون، یەکسەر حوکمی ئەوانی هەبێ، هەروەك چۆن هیچ کەس بە یەك دوو سیفەتی مونافیقان نابێتە مونافیق، بەڵام دیارە ئەوەی زیاتر لەوان بچێ‌و سیفەت و خەسڵەتە دەروونی‌و رواڵەتی‌یەکانیانی تێدابن لە حوکمی ئەوان نێزیکترە.

**دوو:** نابێ هیچ کەس لەم فەرمایشتانەی پێغەمبەرﷺ وا بفامێتەوە کە هەموو ئەو خەسڵەت و نیشانانەی (خوارج) لەزاتی خۆیان داو لەهەموو حاڵێك دا خراپن! چونکە ئەوە هەڵەیەو، زۆر نوێژکردن و ڕۆژوو گرتن و قورئان خوێندن هەر کامێکیان عیبادەتی گەورەو گرنگن، بەڵام بۆیە ئەم شتانە لەوان دا بوونە مایەی زەم و گلەیی، چونکە زیاتر شتی ڕواڵەتی‌و بێ کاکڵ بوون و لەسەر حیسابی شتی تریش بوون.

**سێ:** ئێمە لێرەدا مەرج نیە مەبەستمان لەم قسانە خەڵك و شوێنێکی تایبەتی بێ، بەڵکو بەگشتی ئەو خەسڵەتانە لە هەندێك کەسدا لەملاولا هەستیان پێ دەکرێ، جا هەیە پشك و بەشی تیاندا کەمەو هەشە زۆر.

---

[1] خاوەنی تەفسیری (أضواء البیان) محمد أمین الشنقیطي، ئاماژەی بەم مەسەلەیە کردووە، بڕوانە بەرگی دووی، تەفسیری سووڕەتی (هود).

## (١٠)

بێگومان پێغەمبەری خوا (محمد) ﷺ نموونەی هەرە بەرزی بەندایەتی بۆ خوا (العبودیة لله)و پێشڕەوو سەرمەشقی بێ هەڵەو پەڵەی دینداریو مسوڵمانەتی‌یە ﴿لقد کان لکم في رسول الله أسوة حسنة..﴾ الاحزاب (٢١) ، دەجا ئاشکراشە کە ئەو زاتە بەرزو سەروەرەمان ﷺ لووتکەی هەرە بەرزی ڕەوشت و خووی بەرزو جوان و ڕەندو پەسند بووە ﴿وإنك لعلى خلق عظیم﴾ القلم (٤) ، وە لەڕاستی‌دا ئەو سەروەری کائینات و پێشەوای پێغەمبەرانە (علیه من الله أفضل الصلاوات وأتم التسلیمات) بەهۆی ئەو خوو و ڕەوشتە شیرین و دڵگیرەیەوە گەورەترین کاریگەری‌ی هەبووە لەسەر دڵ و دەروونی دوژمن و ناحەزانیشی ﷺ جای دۆست و هاوەڵانی! دەمادام وایە با ئێمەش کە خۆمان بە شوێنکەوتووی ئەوو ئومەتی دەزانین، هەوڵ بدەین وەك ئەو بین و خاوەنی فەزڵ و چاکە بین بەسەر خەڵکەوەو هەمیشە لەوان چاکتر بین بۆ ئەوان، لەئەوان بۆ ئێمەو، بەڕاستی حەیفە ئێمە ڕابەرو پێشەوایەکی ئاوامان هەبێ کەچی خەڵکی‌تر لەئێمە ڕەوشت جوانترو بەخوولق و خووترو ڕووخۆشترو بەگفت و لوتف ترو خاوەن سەلیقەتر بێ لەعەمەل و کەوت و ڕەفتاری هەمە جۆری سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌دا.

## (١١)

ئومێدو هیوامان بە لوتف و کەرەم و ڕەحمەتی خوا زۆرە کەهاش ڕاست بوونەوەی بزووتنەوەی ئیسلامی و گەشەکردن و گەیشتنی بەئاستی پێویست ڕێگا لەپێش هەموو ئیسلامی‌یەکانی کوردستان تەخت و هەموار بێت، بۆ ئەوەی لەبەك بازنەو جوغزی فراوانی کاردا یەك بگرن و، ببینە یەك دەنگ و ڕەنگ و سەنگ و، لەحاڵێکی واشدا ڕێگا لەبەردەم حاڵەتی ئیسلامی‌دا ئاچووغ دەبێ کە بەهاوکاری‌ی جەماوەری مسوڵمانی کورد کارێك بکەن کە خوا داوای کردووە، مایەی ڕەزامەندی‌یەتی‌و گەلی کوردیشی

پێ لەخەمی دونیاو قیامەتان دەرەخسێ و ڕزگاری دەبێ، کە ئەویش بەرپاکردنی حوکمی خوایە ﴿أن أقيموا الدين ولا تتفرقوا فيه. كبر على المشركين ماتدعوهم إليه. الله يجتبي إليه من يشاء ويهدي إليه من ينيب﴾ الشورى (١٣).

کەواتە:

باهەم خوشك و براياني دڵسۆزی نێو بزووتنەوەی ئیسلامی و هەم خوشك و براياني ئیسلامی ی تریشمان بزانن کە مەسەلەی چاککردن و بەرەو پێش بردنی بزووتنەوەی ئیسلامی، مەسەلەیەکی حیزبی ی تەسك نیەو، بەبڕوای ئێمە مەسەلەیەکە چارەنووسی هەموو ئیسلامی یەکانی پێوە بەستراوەو، چ بەباری ئیجابی و چ سەلبی دا کاریگەری ی گرنگ و مەزنی لەسەر ڕەوتی بووژاندنەوی ئیسلامی ی کوردستان و عێراقیش هەیە.

کەواتە باهەمووومان بەشداری ی جیدی بکەین لەو پرۆسەیەدا، ئەگەر بەقسەیەکی خێر یان دوعایەکی نێو نیوە شەویش بێ، بێگومان خوای میهرەبان پاداشتی چاکەی چاکەکاران زایە ناکات ﴿إن الله لايضيع اجر المحسنين﴾.

---



# لەکۆتاییدا

رەنگە زۆر کەس دوای خوێندنەوەو تێگەیشتنی ئەم نامیلکەیە ئەم پرسیارەی بۆ درووست بێ‌و رووومان لێ بکات وبلێ:

باشە مادام وایە بۆچی کارێك ناکەن کەبزووتنەوەی ئیسلامی لەم حاڵەی ئێستای قوتار بێت و بەپێی ئەم بنەما شەرعییانە بەرێوە بچێ‌و، بەگوێرەی ئەو بنچینە ئەخلاقیانە لەگەڵ کۆمەڵگادا رەفتار بکات؟!!

منیش هەر بەکورتی لەجیاتی خۆم و هەموو ئەو دڵسۆزانە کە ئەوە دە (١٠) ساڵی رەبەقە بەبەر هەورازی چاککردن و راستکردنەوەو بەرەوپێش بردنی بزووتنەوەی ئیسلامییەوەن و زۆریش ماندوو و سەغڵەت بوو ون دەڵێم:

ئێمە ئەوەندەی تواناما‌ن هەبووەو عەقڵمان پێ‌ی شکاوە، لەسنووری شەرع دا کردوومانەوە، خوا پشتیوان بێ هەر بەردەوامیش دەبین، هەتا خوای پەروەردگارو کاربەجێ و دادگەر بە لوتفی خۆی دەرووی خێرمان لێ دەکاتەوەو بزووتنەوە بەهەموڵ و هیممەت و دڵسۆزی‌ی هەموو لایەك راست دەکاتەوەو دەیباتە ئەو ئاستەی کە بتوانێ بەهاوکاری‌ی ئیسلامی‌یەکان و موسڵمانانیش بەگشتی هیواو ئاواتی جەماوەری موسڵمان بەگشتی‌و ئیسلامی‌یەکان بەتایبەت بێنێتەدی، ومخواش یاربێ لەژێر هیچ فشارێك دا ببر لەهیچ رێگاو وەسیلەیەك ناکەینەوە کە تۆزقاڵێك ئەگەری بێ شەرعی‌ی تێدا بێت.

خواش بەکەرەمی خۆی لە کەم و کوڕییو هەڵەو خراپەکانمان ببورێ و زیاترو چاکتر هیدایەتمان بدات بۆ باشتر پەرستن و بەندایەتی بۆ کردنی.

ربنا اغفر لنا ولإخواننا الذين سبقونا بالإيمان ولاتجعل في قلوبنا غلا للذين آمنوا ربنا إنك رؤوف رحيم. وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

نیوە شەوی جومعە، شەشی (ذو القعدة) ی ١٤١٧ ی کۆچی

١٤ لەسەر ١٥ ی (ئادار) ی ١٩٩٧

مەریوان

# نیوەرۆک

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |

# ئەم نامیلکەیە...

بۆیە ئەم نامیلکەیەم ناونا (بزووتنەوەی ئیسلامیو ئاسۆیەکی گەش و ڕوون) چونکە، قەناعەتم وایە ئەگەر بزووتنەوەی ئیسلامی بەقیادەو قاعیدەیەوە بتوانێ چاو بەخۆیدا بگێڕێتەوەو بەپێی ئەم بنەما شەرعیو بنچینە ئەخلاقییانە بەرەوە بچێ، ئەوە بەرەو داهاتوویەکی باش و ئاسۆیەکی گەش و ڕوون دەچێ، جا لەسەر بناغەی ئومێندی خێرو متمانەداربوون بە دڵسۆزانی نێو بزووتنەوە کە ئەو کارە ئەنجام بدەن وەک گەشبینییەک ئەو ناوەمان لەم نووسراوە نا.